٣٢





# خۆرى ئیسلام



گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئایینی وەرزییە



وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی هەرێمی کوردستان دەری دەکات

سالی نۆیەم شەعبانی ١٤٢٧ - گەلاوێژی ٢٧٠٦ - ئەیلوولی ٢٠٠٦

## دادگایی کردنی سەددام، سەرەتایەک بۆ سارێژکردنەوەی برینەکانی ئەنفال و کیمیاباران

# ئەنفال کردنی گەرمیان ...



محەمەد شاکەلی

پرۆسەی وێرانکردنی ئەو ناوچە ئازاد کراوانەی گەرمیان کە زیاتر لە ٤٠٠ گوند و هەزاران کیلۆمەتر دووجا و سەدان هەزار مرۆڤی دەگرتەوە فەرامۆش نەکرابوو، بەڵکو لەلایەن سەرانی حزبی بەعسەوە دواخرابوو بۆ جێبەجێ کردنی چاوەڕێی دەرفەتی گونجاویان دەکرد.

هێرشی ئەنفال بۆ گەرمیان، لە کۆتایی ئازاری ١٩٨٨دا دەستی پێکرد و لە ناوەڕاستی مایسی هەمان ساڵدا، کۆتایی بەپرۆسەکە هێنرا. هەموو ناوچەکە جگە لە ناوەندی شاری کفری، کەلار، چەمچەماڵ، خورماتوو و چەند ناحیەیەك، بوو بەرووبەرێکی وێران و بێ گیان، لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی ١٩٨٨دا، هەموو گوندەکان وێران کرابوون و جگە لە چەند مەفرەزەیەکی بچووکی پێشمەرگەی پارتیزان نەبێت ژیانی ئاسایی و ئاشکرای مرۆڤی تیادا نەما.

پرۆسەی ئەنفالکردنی کورد گەلێ لەوە گەورەترە، لێرەدا بەچەند لاپەرەیەك لەناو باسێکی گشتیدا لەسەری بدوێین، دوای تێپەڕ بوونی ١٤ ساڵ بەسەر ئەو کارەساتەدا بابەتی زۆری لەسەر نووسراوە و باس و لێکۆڵینەوەی زۆریشی لەسەر ئەنجام دراوە، بەڵام هەموو ئەمانە کە جێگای نرخاندنن حەقی تەواویان نەداوە بەو کارەساتە و هێشتا وەکو پێویست لە مەوداکانی ئەنفال نەگەیشتووین و هێشتا ئەو کارەساتە نەبۆتە کارەساتێکی نەتەوەیی تا لەناخی هەموو کوردێکدا جێگای خۆی بکاتەوە.

بۆ خۆم، لە نزیکەوە ئاگاداری چۆنیەتی جێبەجێ کردنی پرۆسەکە بووم لە گەرمیاندا، چونکە پاییز و زستان و بەهاری ١٩٨٧ - ١٩٨٨ وەکو پێشمەرگەیەك لە گەرمیاندا لەناو رووداوەکاندا بووم، بەڵام ناتوانم قەناعەت بەخۆم بهێنم وەکو پێویست نە بەندە و نە زۆربەی رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد لە مەبەست و نهێنیەکان و مەوداکانی ئەنفال گەیشتووین یان کاری جدیمان ئەنجامداوە، بۆ ئەوەی بەتەواوی لێی حاڵی ببین.

لەو رۆژەوەی رژێمی بەعس دەستی بەجێبەجێ کردنی پرۆسەی ئەنفال کرد هەتا روخانی ئەو رژێمە لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەم تاوانە و ئاسەوارە کارەساتبارەکانی لەسەر میللەتی کورد و کەس و کاری ئەنفالکراوەکان لە بازنەیەکی سنورداردا مابووەوە و تەنانەت راپەڕینی (١٩٩١)یش نەبووە هۆی بەدیار خستنی هەموو لایەنەکانی دەرئەنجامی ئەنفال، بەڵام کاتێك سەدام و سەرانی رژێمەکەی کە راستەوخۆ بەشداریان لە پرۆسەی ئەنفالدا کردبوو، لەسەر ئەو تاوانەیان کەوتنە بەردەم دادگا و شایەتەکانی ئەنفال لە بەردەم دادگا و لە بەردەم کەناڵەکانی راگەیاندنی عەرەبی و جیهانیدا رۆژانی ئەنفال و رادەی دڕندەیی سەدام و رژێمەکەیان رونکردەوە، خەریکە ئێستا رای گشتی عێراقی و عەرەبی ئیسلامی کەمێك لەو تاوانانە شارەزا دەبن و رەنگە پرۆسەی دادگایی کردنی سەدام و سەرانی رژێمەکەی لەسەر تاوانەکانی ئەنفال دەروازەیەك بێت بۆ زیاتر ناساندنی گەلی کورد بە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی و فاکتەرێکی بەهێزیش بێت لە رێگای گەیشتنە ئامانجی ئەم میللەتە ستەم دیدە بە ئاواتە نەتەوەیی و نیشتمانیە رەواکانی.



# خۆرى ئيسلام


گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی
لەهەرێمی کوردستانی عێراق دەری دەکات

سالی نۆیەم 32

شەعبان ١٤٢٧ کۆچی گەلاوێژی ٢٧٠٦ کوردی

ئەیلوول/ ٢٠٠٦ی زایینی





بۆ ناردنی بابەتەکانتان پەیوەندی بەم ئیمێلەو فاکسە بکەن:
EmilL Ministry_awqaf@yahoo.com
Fax: 2227951







**ناونیشان**

هەولێر – دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی/ بەڕێوەبەرایەتی راگەیاندن

پیت چنین و نەخشەسازی و بەرگ و جیاکردنەوەی رەنگەکان: کۆمپیوتەری دەریا — چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ

﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ
عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا
لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ
الرَّسُولِ سَبِيلًا ●
يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ
فُلَانًا خَلِيلًا ●
لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ
بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ
الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ
خَذُولًا﴾



سورەتی فورقان: ٢٧-٢٩




# خۆری ئیسلام و ئەرکی قۆناخی نوێمان

پەیامی خۆری ئیسلام

سەرنووسەر

کاتێك ئەم ژمارەیەی خۆری ئیسلام دەکەوێتە بەردەست بەڕێزتان چەند مانگێکە هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان یەکی گرتۆتەوە لەراستیدا ئەم رووداوە یەکخستنی دوو ئیرادە بوو پێش ئەوەی یەکخستنی دوو ئیدارەکە بێت، بەڵکو ئەوە خواستی هەموو گەلی کوردستان بوو، بەم یەکگرتنەوەیە وەزارەتی ئەوقاف ئەرك و کاری فراوانتر بوو ژمارەیەکی گەورەترو زیاتر لەزانایانی ئاینیو مزگەوت و شوێنەکانی خوداپەرستی گرتە ئەستۆ، ئەوەش وادەکات ئیلتیزامات و ئەرکەکانی ئێمەش زیاترو قورستر بێت و دەبێ کاری جدی و زیادە لەتوانای خۆمان ئەنجام بدەین و بیر لەداهێنان و حیکمەتی نوێ بکەینەوە تابتوانین نمونەیەك بەرهەم بهێنین کە جێگای چاولێکەری بێت و بەنمونە بهێنرێتەوەو خەڵکانی دیکە چاو لەدووربینیو سیاسەتی نوێی وەزارەتی ئەوقاف بکات، ئەوەش رێگای راستەقینەی خزمەتکردنە بەمیللەت و پێشکەوتنی هەمەلایەنەی وڵاتەکەمانە، بەڵام دەبێ ئەو راستیە بزانین کە بەستەڵەکی (١٠) ساڵ بە (١٠) رۆژ یان بەچەند مانگێك ناتوێتەوە ئەو لێکترازانەی کەتووشی گەلی کورد بوو پێویستی بە کاتی زیاترو ماندوبوونی زیاترو دڵسۆزی زیاتر هەیە، لەوانەشە پرۆسەی بەردەوامبوونی یەك ئیرادەیی گەلی کورد پێویستی بەپلانێکی تۆکمەو بەسەبرو کاری جدیو داهێنان و حەماسەتی هەر یەکەمان هەیە، ئێمە خوازیاربووین گۆڤاری خۆری ئیسلام بە بەرگێکی قەشەنگ دەربچوایە کە لەئاست رووداوەکاندا بوایە، بەڵام هەموو ئەوانەی لەم گۆڤارەدا کار دەکەن جگە لەوەش کاری ئەسڵی خۆیان هەیەو لەهیچ ژمارەیەکدا نەتوانراوە خۆیان بۆ ئەم گۆڤارە تەرخان بکەن و هەرچیەکمان کردبێت گۆڕانکاری پێویست لەگۆڤارەکەدا لەهەردوو بواری ناوەڕۆك و ڕوخساردا، لەبەر ئەوە دەمانەوێت خوێنەرانی بەڕێز دڵنیابکەین و بەڵێنیان بدەینێ کە لەمەودوا بەنیازین گۆڕانکاری پێویست بکەین بەمەبەستی گەیاندنی گۆڤارەکە بەئاستێك کە لەئاست پێشهاتەکانی ئەمڕۆی کوردستان و ناوچەکەدا بێت دەبێ بەگیانی ئایینپەروەری لەرووی هەست کردن بەمەسئولیەتی قۆناغەکە بەهەموو هێزو توانایەك لەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزەی قورئان کار بکەین کەدەفەرموێت ﴿**أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ**﴾. وە بۆ بەدیهێنانی حیکمەتی پێغەمبەرمان (محمد مصطفى) د.خ کاتێك لەحەدیسێکدا دەفەرموێت (**لايؤمن احدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه**) صدق رسول الله.





﴿ ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ / البقرة:٢ ﴾



## ساتێك له سایەی قورئاندا

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم/٢١

**مەلا مەحمود حوسێن**

هاوسەرگیری سونەتێکە لە سونەتەکانی خوا لەناو دروستکراوەکانی، نەجیهانی مرۆڤ نەجیهانی ئاژەڵ ناتوانێ خۆی لێ بێ نیاز بکا وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الذاريات/ ٤٩). هاوسەرگیری ئەو شێوازەیە کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە بۆ لەدایك بوون و زۆر بوون و بەردەوامی ژیان دوای ئەوەی هەردوو هاوسەر ئامادە دەبن و خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، بەو شێوەی کە هەردووکیان بەدەوری پۆزەتیڤی خۆیان هەڵدەستن لە بەدیهاتنی ئەم ئامانجە، وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (سورة الحجرات/ ١٣).

ویستی خوای گەورە وانەبووە مرۆڤیش وەکو بوونەوەرەکانی تر واز لە غەریزەی خۆیان بێنن بەڵکو سیستەمێکی سەرەوەرو لەباری بۆ داناوە کە شەرەف و کەرامەتی بپارێزێ و پەیوەندی پیاو،





بەژنی کردووە بە پەیوەندییەکی بەڕێزو لەسەر ڕەزامەندی هەردوو لایەنی بنیات ناوە وەکو (ایجاب و قبول) وەکو دوو دیاردە بۆ ئەم ڕەزامەندییە بەم جۆرە ڕێگەیەکی پاکی بۆ غەریزە داناوەو وەچە لە فەوتاندن دەپارێزێ‌و ئافرەتیشی پاراستووە لەوەی ببێتە ئامرازێك هەر کەسێ بە ویستی خۆی بەکار بهێنێت.

کاتێ پێغەمبەر(ص) هەموو شێوازە ژن هێنانەکانی نەفامی لەناو برد تەنها ئەو ژن هێنانەی وەکو ئەمڕۆی هێشتەوە، کە ڕێگەی ژن هێنان و هاوسەرگیری لەزەمانی نەفامی بەم جۆرە بوو.

یەکەم: ژن هێنانی ژن گۆڕینەوە. پیاوێك بە پیاوێکی تری دەگوت بۆم دەستبەرداری ژنەکەت بە ئەمنیش بۆت دەستبەرداری ژنەکەم دەبەو زیادەت لەسەر دەدەمێ.

دووەم: ژن هێنانی دۆست گرتن بە نهێنی وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ولاتتخذان اخدان﴾.

سێیەم: ژن هێنانی کۆمەڵ: بەشێوەیەك کۆمەڵە پیاوێك ژنێکیان دەهێنا.

چوارەم: چەند جۆرە ژن هێنانێکی تر کە ئیسلام هات پووچەڵی کردنەوە لەبەر پاراستنی ژن و پاراستنی نەسەب.

ئیسلام هانی خەڵکی دەدا لەسەر ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری بە چەند وێنەیەکی جیاجیا، جارێك باسی ئەوە دەکا سونەت و هیدایەتی

**کۆچ کردنی گەنج و لاوەکان بەرەو هەندەران و بەرپا بوونی شەڕی کەنداوو سەرهەڵدانی دیاردەی تیرۆرو بەردەوام بوونی شۆڕشەکانی کورد وای کرد ڕێژەی ئافرەت چەند بەرامبەر پیاو زیاد بکا**

پێغەمبەرەکانە کە ئەوان پێشەواو چاوساغن کە پێویستە لەسەرمان ئێمە چاویان لێ بکەین ﴿ولقد أرسلنا رسلاً من قبلك وجعلنا لهم أزواجا وذرية وما كان لرسول أن يأتي بآية إلا بإذن الله لكل أجل كتاب﴾ الرعد/ ٣٨.

هەروەها پێغەمبەر(ص) دەفەرمووێ: ﴿اربع من سنن المرسلين الحناء، والتعطر، والسواك، والنكاح﴾ رواه الترمذي.

واتە چوار شت لە سونەتی پێغەمبەرانە سەرۆپیش خەنە کردن، خۆ بۆن خۆش کردن، سیواك کردن، ژن هێنان.

هەروەها پێغەمبەر(ص) جارێکیان بە عەکافی کوڕی وەداعەی فەرموو ژنت هێناوە؟ وتی نەخێر، فەرمووی کەنیزەکیشت نییە؟ وتی نەخێر. فەرمووی تۆ گەنجی و ماڵیشت هەیە؟ وتی بەڵێ. دەی کەوایە تۆ برای شەیتانی یا ڕاهیبە گاورەکانی ئەگەر ئەتۆ لە ئێمەی، ئێمە چی دەکەین تۆش ئەوە بکە چونکە سونەتی ئێمە ژن هێنانە.

لەقورئاندا باس لەوە دەکا کە هاوسەرگیری ئایەتێکە لە ئایەتەکانی خوا وەکو لەم دەقەدا هاتووە ﴿ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجا لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودة ورحمة إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون﴾ الروم/ ٢١.

ئافرەت چاکترین گەنجینەی گیانی و دەروونییە بۆ سەر کەسایەتی پیاو. وەکو پێغەمبەر(ص)




دەفەرمووێ «الدنيا متاع وخير متاعها المرأة الصالحة» رواه مسلم.

هەڵبەتە هاوسەرگیری چاکترین دەرمانە بۆ ئەو گەنج و لاوانەی گەیشتوونەتە تەمەنی خۆ ناسین کە ئەرکی سەر شانی باوکەکانە ژن بۆ کورەکانیان بێنن و کچ و خوشکەکانیشیان بە مێرد بدەن. وەکو لەم دەقەدا هاتووە کە پێغەمبەر(ص) دەفەرمووێ «یامعشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فانه اغض للبصر واحصن للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم فانه له وجاء».

واتە: ئەی کۆمەڵەی گەنج و لاوەکان هەر کەسێ توانای هەیە با ژن بێنی چونکە چاو و داوەن لە گوناه دەپارێزیٚ و هەر کەسیش نەیتوانی ژن بێنیٚ با بۆ خۆی بەڕۆژوو بێ چونکە ئارەزووی کپ دەکاتەوە.

هەڵبژاردنی هاوسەری چاک و باش پێویستە لەسەر پیاو چونکە مافی کورە لەسەر باوك کەوا دایکی باشی بۆ هەڵبژێریٚ و ناوی خۆشی لیٚ بنیٚ و فێرە قورئانی بکا.

ژن دڵ ئارامی دەبەخشێتە پیاو چونکە ژن هاوبەشی ژیانێتی، پەروەردەکەرو هەڵسووڕێنەری کاری ماڵەکەیەتی، دایکی منداڵەکانێتی، جێگەی حەوانەوەی دڵ و دەروونیتی، جێگەی نهێنی و چپەکانیەتی.

لەبەر ئەوە ئیسلام بایەخ و گرنگی داوە بە هەڵبژاردنی هاوسەری باش و دەستکەوتێکی نرخداری داناوە پێویستە لێی بە ئاگابین و سوور بین لەسەری. چونکە پێغەمبەر (ص) وشیاری کردووینەوە لەسەر ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەو دەفەرمووێ «اياكم وخضراء الدمن، قيل يارسول الله وما خضراء الدمن؟ قال المرأة الحسنة في المنبت السوء».

واتە: وریای خۆتان بن لە (خضراء الدمن) وترا ئەی پێغەمبەری خوا (خضراء الدمن) چییە؟ فەرمووی ئافرەتی چاکە لە ماڵێکی خراپ گەورە بووبی.

پێغەمبەری خوا (ص) ئافرەتی چاکی بۆ دیاری کردووین کە دەبی چۆن بیٚ؟ دەبیٚ تا ئاستێك جوان بێت، گوێڕایەڵ بیٚ و قسەت نەشکێنیٚ و خۆی و ماڵەکەت بپارێزیٚ وەکو دەفەرمووێ «خير النساء من إذا نظرت اليه سرتك، واذا امرتها اطاعتك واذا اقسمت عليها ابرتك، واذا غبت عنها حفظت في نفسها ومالك».

محمد کوڕی کعب: لەمانای (ربنا آتنا في الدنيا حسنة) دەڵیٚ: لەگەڵ ژنی باش و چاکیەتی.

بوخاری و موسلیم لە خاتوو عائشە دەگێڕنەوە کە سیٚ کەس هاتنە ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر (ص) پرسیاریان لە خواپەرستی پێغەمبەر (ص) کرد کە وەڵامیان درایەوە خواپەرستی پێغەمبەریان بە کەم هاتە بەرچاو، وتیان ئێمە لە کویٚ و پێغەمبەری خوا لەکویٚ، پێغەمبەری خوا لەگوناهی سەرەتاو کۆتایی خۆش بووە، بۆیە یەکێکیان وتی

> **هاوسەرگیری چاکترین دەرمانە بۆ ئەو گەنج و لاوانەی گەیشتوونەتە تەمەنی خۆ ناسین کە ئەرکی سەر شانی باوکەکانە ژن بۆ کوڕەکانیان بێنن و کچ و خوشکەکانیشیان بە مێرد بدەن**




ئەوە دەبێ ئەمن هەر شەونوێژ بکەم و نە خەوم.. دووەمیان وتی ئەوە ئەمنیش دەبێ بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو بم.. سێیەمیشیان وتی ئەوە ئەمنیش واز لە ئافرەت دێنم و هەتا ماوم ژن ناهێنم... کە پێغەمبەر (ص) ئەم قسانەی بیستەوە هاتە لایان فەرمووی ئەوە ئێوە واو... واتان وتووە؟ ئەوا من لە هەر هەمووتان زیاتر لەخوا دەترسم و پارێزی لێ دەکەم ئەمجا ڕۆژوو دەگرم و بەڕۆژووش نابم، شەوونوێژ دەکەم و دەشخەوم.. وە ژنیش دێنم هەر کەس لە سونەتی من لابدا ئەوە لە من نییە.

جا ژنی چاك و باش بەختەوەری و ئاسوودەیی و ڕووناکی دەخاتە ماڵ.

بەڵێ هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ پێویستی یەکترن و بێ یەك هەڵناکەن، بێ یەکتر ناتەواون بۆیە لەڕێگەی هاوسەرگیری ژن و مێرد بەرەو کاملی دەچن.

**هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ پێویستی یەکترن و بێ یەك هەڵناکەن، بێ یەکتر ناتەواون بۆیە لەڕێگەی هاوسەرگیری ژن و مێرد بەرەو کاملی دەچن**

جا ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژانێك زیاتر کچ و کوڕان پێویستییان بە هاوسەرگیری هەیە.. هاوکات لە هەموو کات و زەمانێك ڕێژەی مێ زیاترە لە نێر نەوەکو هەر لەڕیزی مرۆڤایەتی بەڵکو لەناو هەموو بوونەوەرەکانی تر..

ئەمڕۆ لە عیراق بە کوردستانیشەوە ڕێژەیەکی زۆر ئافرەت لە کچ و قەیرە کچ و بێوەژن زیادی کردووە چونکە ڕۆیشتنی گەنج و لاوەکان بەرەو هەندەران و ئەوانەی لە شەڕی کەنداو و زۆری تیرۆرو بەردەوام بوونی شۆڕشەکانی کورد فەوتان، وای کرد لەڕێژەی ئافرەت چەند بەرامبەر ڕێژەی پیاو زیاد بکا. بۆیە لەسەر تاك و خێزان و کۆمەڵگا بەتایبەتی و حکومەت و دەزگاکان پێویستە هاوسەرگیری بکەنە خەمی هەرە پێشینەی خۆیان و کەڵکە بوونی ئافرەت لەم قەیرانە ڕزگار بکەن بۆ ئەوەی کۆمەڵگا شیرازەی لەبەر یەك هەڵنەوەشێ و تووشی خراپە و فەسادی نەبێت، بە نەخۆشیی بێ چارەسەریی ئەورووپاو ڕۆژئاوا نەچین چونکە یەکەم فیتنە لە بەنی ئیسرائیلییەکان ڕووی دا لە ڕێی ئافرەتەوە بوو..




# شنەی وەشتی سروش و پەیام

# ان الله اوحى الىَّ ان تواضعوا..

**حوسێن نادر**

سوننەتی خوا لەم بوونەوەرەدا وایە ئادەمیزاد لەسەر سیفەت و خووڕەوشتی جوانی راستەقینە بمێنێتەوەو لەناوخۆیاندا کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر هیچ کەس...

پەیامی پێغەمبەرەکانیش هەر هەموویان بۆ ئەوە هاتوونە قەدەغەی ئادەمیزاد بکەن لەخۆبایی بوون و خۆ بە بەرز زانین لەسەر زەوی هەر وەکو لەم دەقەی قورئاندا هاتووە ﴿ولا تصعّر خدّك للنّاس ولا تمش في الأرض مرحا﴾ و لەم فەرموودە قودسییەدا هاتووە ﴿انما اتقبل الصلاة ممن تواضع بها لعظمتي﴾ (التواضع) یانی خۆ بە کەم زانین و خۆ بە بچووك دانان بۆ خوای گەورە.

بۆیە لەم فەرموودە قودسییەدا هاتووە ﴿الكبرياء دائي والعظمة ازاري فمن نازعني فيهما ادخلته ناري﴾.

لەم دەقەی قورئاندا هاتووە ﴿تلك الدّار الآخرة نجعلها للّذين لا يريدون علوّا في الأرض ولا فسادا والعاقبة للمتّقين﴾ (القصص/ ٨٣).

ئەم ئایەتە دەربارەی دوو پیاو هاتوونە کە دونیایان پڕ فەسادی و خراپەکاری و خۆ بەگەورە زانین کرد، یەکێکیان هێزو دەسەڵاتەکەی، دووەمیشیان سەروەت و سامانەکەی فریوی دان.. ئەوەی هێزو دەسەڵاتەکەی فریوی دا ئەوە فیرعەون بوو ئەوەی سەروەت و سامانەکەشی فریوی دا قاروون بوو...

دەگێڕنەوە پیاوێك لەخزمەت حەزرەتی موسا دانیشتبوو بەشانازی و خۆ بەگەورە زانین باسی باب و باپیرانی خۆی دەکرد، هێندەی پێ نەچوو حەزرەتی جوبرائیل هات بەحەزرەتی موسای فەرموو هەواڵ بەم پیاوە بدە بە خۆی و باب و باپیرانی ئەوانەی باسی کردن کە نۆ کەس بوون هەموویان لەناو ئاگری دۆزەخ دانە.. لەبەرچی؟

چونکە شانازی کردن و خۆ بەگەورە زانین نابی بە حەسەب و نەسەب بی، بەڵکو دەبێ بەخۆ بەنزم زانین و کردەوەی باش بێت. بۆیە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ ﴿**لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال حبة من كبر**﴾ دیسان پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمووێ ﴿**من تواضع رفعه الله ومن تكبر وضعه الله**﴾.

ئیمامی عومەریش دەفەرموێ (راس التواضع ان تبدأ بالسلام على من لقيته من المسلمين).

دەگێڕنەوە مطرفی کوڕی عبدالله چاوی بە المهلب کەوت کە پیاوێکی دەوڵەمەندو لەخۆبایی بوو جوبەیەکی لەبەر بوو بەکەش و فشەوە دەڕۆیی.. مطرف گوتی ئەی بەندەی خوا.. خواو پێغەمبەر ئەم ڕۆیشتنەی تۆیان پێی خۆش نییە، مهلب گوتی ئەتۆ ئەمن دەناسی مطرف گوتی بەڵێ





# شانازی کردن و خۆ بەگەورە زانین نابی بە حەسەب و نەسەب بی، بەڵکو دەبێ بەخۆ بەنزم زانین و کردەوەی باش بێت

باشت دەناسم سەرەتا پشکە ئـاوێکی سـپیی و کۆتاییەکەشـت لاشـەیەکی قێزاوییەو تۆ لـە ناوەنـدیان دای ئەمجارە مهلب ڕۆیشت و وازی لە ڕۆیشتنەکەی هێناو تۆبەی کرد.

دەرمـانی خـۆ بەگـەورە زانـین (الکـبر) خـۆ بـە نـزم زانینـە (التواضـع)ە، وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرموێ ﴿واخفضْ جَناحَكَ لمَنِ اتَّبعَكَ مـنَ المُـؤمنينَ﴾ واخفـض جناحك واتە خۆ بەکەم زانین (التواضع).

پێغەمبـەر(د.خ) دەفـەرموێ ﴿ان الله اوحـى الى ان تواضعوا حتى لايفخر احد على احـد ولايبغي احـد على احد﴾ رواه مسلم.

دیسان دەفـەرموێ ﴿مانقصت صدقة من مال ومازاد عبدا بعفو الا عزا وما تواضع احـد الا رفعـه الله﴾ رواه مسلم.

یـەکێ لـە حەکیمـەکان دەڵـێ ﴿التواضـع احـد مصائد الشرف. والشرف مع التواضع﴾.

لـە نموونـەی خـۆ بـە نـزم زانـین (التواضـع) لـە پێغەمبەری خوا (د.خ) چاولێکەرییەکی جوان هەیە، پێغەمبـەری خـوا (د.خ) لـەڕووی خـۆ بـە نـزم زانـین جاری واهەبووە لەڕێگادا لەگەڵ پیرەژن ماوەتـەوە. پرسـیاری لـێ دەکـردو ئـەمیش وەڵامـی داوەتـەوە.. لەسـەر حەسیر دادەنیشت و سـەری بـە بـالیفی گـەڵا خورمـا دەکـرد.. جارێکیـان عـدی کـوڕی حـاتمی طـــائي هاتـــە لای پێغەمبـــــەر(د.خ) دۆشـەکەکەی دایـە حـاتم و بـەخۆی لەسـەر عـەردی دانیشت..

پێغەمبـەری خـوا سواری گوێدرێژ دەبوو.. جلکـی خـۆی دەدووریەوەوە.. مەڕی بۆ خـۆی دەدۆشـی و.. کـە لـەناو هاوەڵـەکانی دادەنیشـت نەتـدەزانی کامـەیان پێغەمبـەرە هـەتا پرسـیارت نەکردبایـە.. هتد. ڕەحمەت لە مەحوی بێ کە دەفەرمووێ:

به نوری عەکسی پێغەمبەر
ئەوەندە مونعەکیس بووبوون
غەریبی تازە هاتوو دەیوت
ئەم پێغەمبەرستانە

خـاتوو عائشـە دەڵـێ ئێـوە زوو لـە گـەورەترین بەندایەتی غافڵ و بێ ئاگا دەبن ئەویش خۆ بە نـزم زانین (التواضع)ە.

ڕەحمەت لە منصوری کوڕی محمدی الکریـزیش بێ دەڵێ:

فـان کنـت في عـز وخـير مَنعـةٍ
فكم تحتها قوم هم منك ارفع
ولاتمـش فـوق الارض الا تواضـعاً
فكم مات من قوم هم منك امتع





# ئایا راستە شیعری (ئەی ڕەقیب) کوفری یە؟!

مامۆستا نەوزاد شەریف عەلی

ڕۆژێك گەنجێکی خوێن گەرمی موسڵمان هاتە لام باسی ئەوەی کرد کە شیعری (ئەی ڕەقیب)ی دڵدار کوفرە چونکە (ڕەقیب) یەکێکە لە ناوەکانی خوا و شاعیر تەحەدای خوا دەکاو پێی دەڵێ: ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان.. ئەمەش خۆی لەخۆیدا کوفرە بۆیە وتنی سروودی ئەی ڕەقیب کوفرە، جا لەمێژە لەوە دەگەڕام سەرەداوێکم بەدەست بکەوێ تا لەو بابەتە بنووسم، قسەی ئەم لاوە سەرە داوەکەی دا دەستم کە بەدوای دابچم.

بەڵێ ڕاستە نکوڵی لەوە ناکرێ کە خوای گەورە ناوێکی (ڕەقیب)ەو لەقورئاندا لەئایەت گەلێکدا هاتووە جا لەسەرەتادا ئەو ئایەتانە دەهێنین کە وشەی (ڕەقیب)یان تێدایە...

﴿إ إنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء /١.

﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ المائدة/١١٧.

﴿وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ هود/٩٣.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا﴾ الاحزاب/٥٢.

﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ الدخان/١٠.

﴿فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ الدخان/٥٩.

﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق/١٨.

﴿إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ طه/٩٤.

ئینجا بابزانین وشەی (ڕەقیب) چییەو لەچییەوە هاتووەو مانای چی دەگەیەنێ..

وەکو لە (الوجوه والنظائر في القرآن الكريم)دا هاتووە دەڵێ: وشەی ڕەقیب بەدوو جۆرو مانا دێ..

جۆرو مانای یەکەم یانی چاوەدێر وەکو لەم ئایەتانەدا هاتووە...

﴿إنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء/١.

واتە: بەڕاستی خوا چاوەدێرە بەسەرتانەوە.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا﴾ الاحزاب/٥٢.

واتە: بەردەوام خوا چاوەدێری هەموو شتێك دەکات.

﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ المائدة/١١٧.

واتە: کاتێ گیانت کێشام ئەوە هەر خۆت چاوەدێری بەسەریانەوە.

﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق/١٨.

واتە: هەر قسەیەکی لە دەم دەرچێت خێرا چاوەدێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.

جۆرو مانای دووەم: یانی چاوەڕوان وەکو لەم ئایەتانەدا هاتووە:

﴿وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ هود/ ٩٣.

واتە: ئێوە چاوەڕێ بن بەڕاستی منیش لەگەڵتاندا چاوەڕێم.

﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ الدخان/١٠.

واتە: چاوەڕێی ڕۆژێك بکە کە دوکەڵێکی ئاشکرا بەری ئاسمان دەگرێت.

﴿فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ الدخان/٥٩.

واتە: جا تۆ چاوەڕێ بە ئەوانیش چاوەڕێن

وە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا هاتووە (ان لله تعالى تسعة وتسعين اسما من احصاها دخل الجنة) رواه الترمذي وابن حبان والحاكم.

واته: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە هەر کەسێ ئاماریان بکا دەچێتە بەهەشت. لە چل و چوارەم ناو (الرقیب) هاتووە.

ئینجا بابزانین مانای رەقیب لەم ئایەتانە لەقورئاندا چۆن هاتوون:

١- (رەقیب) بۆ ناوی خوا هاتووە وەکو ئەم ئایەتە ﴿أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ المائدة/١١٧.

٢- (رەقیب) بۆ پێغەمبەر هاتووە وەکو ئەم ئایەتە ﴿إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ﴾ هود/ ٩٣.

٣- (رەقیب) بۆ فریشتە هاتووە وەکو ئەم ئایەتە ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ﴾ ق/١٨.

٤- (رەقیب) بۆ کافر (دوژمن)ان هاتووە وەکو ئەم ئایەتە ﴿إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ﴾ الدخان/٥٩.

جا خۆ هەر وەنەبێ دڵدار وشەی رەقیبی لە شیعردا بەکارهێنابێ بەڵکو هەموو کەڵە شاعیرەکانی پێشوو وشەی (رەقیب)یان لە شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە، بەلأم بابزانین پەیوەندی (رەقیب) چییە بە شیعری شاعیرەکانەوەو بۆچییان بەکار هێناوە...

وەکو لەزووتر وتمان وشەی رەقیب بەچوار جۆرو مانا هاتووە بۆ خوا، پێغەمبەر، فریشتە، کافر یا دوژمن...

بابزانین شاعیرەکان مەبەستیان لە رەقیب کامە چەمك و واتایە لە شیعرەکانیان ئایا مەبەستیان لەم چوار چەمك و واتایە کامەیە؟.

باوەڕناکەم کەس ئاوەزی قبوڵی ئەوە بکا شاعیرەکان مەبەستیان لە بەرکاهێنانی وشەی رەقیب ناوی خوا بێ و لەگەڵ خوایان بێ چونکە شاعیرەکانی پێشوو هەموویان زانای ئیسلام و دەرچووی حوجرەکان بوون و خواناس و لەخواترس بوون کەس بیری بۆ ئەوە ناچێ بەر لە دوو سەدە زیاتر یاکەمتر مەلاو زانایانی کورد کە شاعیر بوون کوفر بکەن و سنووری خوا ببەزێنن یان بە بەکارهێنانی وشەی رەقیب سووکایەتی بەخوا بکەن، نەحاڵ و مەقامی شیعرەکانیش ئەوە هەڵدەگرێ وەنە بەمەبەستیان لە فریشتەو پێغەمبەریش بووە، بەڵکو لە بەکارهێنانی وشەی رەقیب تاکە مەبەستیان چەمك و واتای

**ئەو کەسانەی داوای ئیسلامەتی دەکەن چ قازانجێك لەوە دەکەن کە دڵدارو بەرهەمی شاعیرو ئەدیبانی کورد بەکوفرو بێ باوەڕی بچوێنن کە شاعیر خۆی مەبەستەکەی وانەبێت**

چوارەمە کە (رەقیب) بە مانا کافر یا دوژمن دێ، لێرەدا شاعیرەکان بەزانایانەو ژیرانە مانای چوارەمیان قۆستۆتەوە لە بەکارهێنانی وشەی رەقیب کە هەر ئەوەیان مەبەستە کە رەقیب چاوەدێرە، بەسەریانەوەو نایەڵێ لەگەڵ یارو خۆشەویستەکانیان بەیەك بگەن و رەقیب بۆتە بەدکارو دوژمن وەکو (کوردی)ی کەڵە شاعیر ئاماژە بۆ ئەم راستییە دەکاو دەڵێ:

دڵ دەڵێ (کوردی) رەقیب دوژمنتە کۆنە لۆتییە

بۆیە وای گوت تا نەزانم کێیە دۆست و دوژمنم

دەسا بۆ راستی بیرو بۆچوونەکانمان گوڵبژێرێك لە شیعری شاعیرە کلاسیکییەکانمان دەخەینە روو کە زۆر پێش دڵدار وشەی رەقیبیان بەکارهێناوەو ئەمانەش دەکەین بە بەڵگەو گەواهی دەیانهێنینەوە خۆ ئەگەر وانەبێ دەبێ بڵێین سەرلەبەری شاعیرە پێشووەکان بێ باوەڕبوونەو شیعرەکانیان کوفری هاوشێوەو کە وشەی رەقیب پانتایی شیعرەکانیانی داگیرکردووە.

**مەلای جزیری دەڵێ:**

پاش فرقەتی، زۆر محبەتی، مەتەلعەتی، چوم حەزرەتی

وەصلا حبیب، من بو نصیب، مەلعون رەقیب رنجور بوو

**بێسارانی دەڵێ:**

چلی نەپەنا، چلی نەپەنا

چلی چۆن رەقیب مەدران نەپەنا

**نالی دەڵێ:**

وەحشییە لێمان لەبەر طعنەی رەقیبی سەگ صیفەت

راستە هەر ذي رۆحێ، بۆ وەسواسە، شەیطانی هەیە

**سالم دەڵێ:**

بۆ من عەزایە قەتلی رەقیبم بەنەمری تۆ

دانەم منافریو نەتەرسەم زو رۆزگار

**کوردی دەڵێ:**




که ڕەقیب دی من و یار پێکەوە نیشتووین لەڕقان
وەك سەگێ پەت بکرۆژێ دەم و لێوی دەکرۆت

**مەولەوی دەڵێ:**

تەرسوون ئەر بەدەن ڕەقیب دڵ سەرد
بکەرۆش وەخاك گەردش چەپ گەرد

**حاجی قادر دەڵێ:**

لەڕێی خوا مەیکە تەحصیلداری ئێمە
ڕەقیبی کافرو بێ دین و بەدخوو

**مەحوی دەڵێ:**

وا دڵ بەداغم ئەز لەڕەقیب ئەرسەری بڕن
بۆ ئەکلی لەحمی ئەم سەگە من دەبمە حەنبەلی

**شێخ ڕەزا دەڵێ:**

وەرە دەستێ بخەمە گەردنی بلوورینت
تاوەکو سفرە لەداخا بدڕی ورگی ڕەقیب

**باوەڕناکەم کەس ئاوەزی قبوڵی ئەوە بکا شاعیرەکان مەبەستیان لە بەرکاهێنانی وشەی ڕەقیب ناوی خوا بێ و لەگەڵ خوایان بێ چونکە شاعیرەکانی پێشوو هەموویان زانای ئیسلام و دەرچووی حوجرەکان بوون و خواناس و لەخواترس بوون**

**ئەدەب دەڵێ:**

ئەدەب بەشەرتی جاران، ئەمنم کە جان سوپاران
کەنەڵێ ڕەقیبی ناداتن بەوەفا نە بوو فلانی

**حەمدی دەڵێ:**

فەلەك گەر پاك طینەت بێ نەنالۆزی هەوا ئەی مەه
ڕەقیب شەیطانە، بۆ ڕەجمی دەبینی چۆن شەهابێکم

**زیوەر دەڵێ:**

عەزیزەکەی حەبیبی من، نیگارەکەی تەبیبی من
باشەق بەرێ ڕەقیبی من! وەرە بەسەد وقارەوە

**ئەحمەد موختار دەڵێ:**

ڕەقیب وەختێ کە دی یار میهرەبانە دەرحەقی عاشق
تەقی کرد وەك سەگ و تۆپی لەداخا ئینتحاری کرد

**ئانی دەڵێ:**

لەبەر جەوری ڕەقیب و دەردی دووری
هەمیشە چاوەڕێی مەرگە حەیاتم

**صافی دەڵێ:**

خۆت ئەگەر بێی بمکوژی خۆشە لەلام ئەمما ڕەقیب
وا دەڵێ مەحبوبە قەتلی تۆی بەگوێی من کردووە

**ئەخۆڵ دەڵێ:**

شەرتە خوێنم با بەگریان ئەڕژێمە صەفحەی عەدەم
یا بەشمشێری ڕەقیبانا ئەبێ بتکێتە خوار

**خادم دەڵێ:**

لێم گەڕێ بەس تووشی هیجرانم کە توخودا ئەی ڕەقیب
دەفعەیێ تر با ببم شاد من بەدیداری حەبیب

**بێخود دەڵێ:**

لەخۆشی ئەو دەمە زۆری نەماوە باڵ بگرم
ڕەقیب کە ئەگری و ئەم شۆخی لاوە پێ ئەکەنی

**میرزا مارف دەڵێ:**

لەڕێی ڕاستی محبەتدا ڕەقیب دووری بێ ناون
بیابانێکی مالا مالی وەسلە مەجلیسی ڕندان

**کەمالی دەڵێ:**

داد لەدەست جەوری بەدخوویی ڕەقیب
نایەڵێ دڵدار یار بێ بەنسیب.

**وافی دەڵێ:**

دایما بۆ شاری وەصلت ناڵە ناڵی وافییە
قاتل الله الرقیب انە من مانعین

**نوری دەڵێ:**

ئەوا موددێکە کەم مەیلی دەزانم خۆ ڕەقیب وای کرد
نەکەی بە قسەی بکەی چونکە خەریکە تۆ لە من بدزی

**عالای دەڵێ:**

فیراق دەردی بێ ئامانە تووشی ڕەقیب بێ
چون فیتنەی تێکدانی بەینی یارانی هەیە

**بەڵێ ئەمە مشتێك بوو لە خەرواری دیوانی شاعیرە گەورەکانی پێشوو کە وشەی ڕەقیبیان بەکارهێناوە لە دیوانەکانیان..**

**ئەم کەڵە شاعیرە گەورانە کە وشەی ڕەقیبیان بەکارهێناوە مەبەستیان کوفرو بێ دینی نییە وەکو** حاجی قادر دەڵێ:




لەرێی خوا مەیکە تەحصیلداری ئێمە

ڕەقیبی کافرو بێ دین و بەدخوو

**یا دوژمنە کە نایەڵێ دوو دڵدارو عاشق بەیەك بگەن جا ئەو کەسەی نایەڵی ئەم دوو عاشقە بەیەك بگەن ئەوە دوژمنە هەروەکو کەمالی دەڵێ:**

داد لەدەست جەوری بەدخوویی ڕەقیب

نایەڵێ دڵدار یار بێ بە نەسیب

**یان عاڵلایی دەڵێ:**

فیراق دەردی بێ ئامانە تووشی ڕەقیب بێ

چون فیتنەی تێکدانی بەینی یارانی هەیە

**جا ڕیشەی ڕەقیب هەر لەمانای چەمك و واتای چوارەم پەرەی گرتووەو شیعری شاعیرەکانیش هەموو ئاماژەی بۆ دەکەن و مەبەستیان هەر لە مانای چوارەمە.**

**گیوی موکریانی کە کابرایەکی زۆر خەستە لە قەومییەتدا لە دیوانی کوردی دا دەڵێ:**

**(ڕەقیب): ئاگادار، چاوەڕێی دوو کەس کە سەوداسەری چتێك بن هەر یەکەی ڕەقیبی ئەوی ترە...**

**ئەگەر بیزانیبا (ڕەقیب) بەمەبەستی شاعیرەکان خوایە ئەوا دەهۆڵی بۆ دەکوتا. بەلام ئەوەی جێگەی سەرنج و تێرامانە بۆ تەنها سروودی ئەی ڕەقیبی دڵدار کوفرەو وتنیشی هەر کوفرە؟! کەچی کوردی کەڵەشاعیرو هەندێکی تر زۆر زووتر لەپێش دڵدار چەند جار گوتوویەتی:**

ئەی ڕەقیب وێڵم لەدەستت لێرە بۆ لێم ناگەڕێی

باوکە کوژتەت نیم ئەرێ هەی بەد مەزهب چیت لێم دەوێ

**یا لەشیعرێکی تردا دەڵێ:**

ئەی ڕەقیب بەس بڵێ یار خۆشی دەوێی من (کوردی)م

کۆنە ڕەندم بەخودا بەو قسە ناکەومە مەلە

**من لام وایە گەورەیی دڵدار لەوەدایە کە هەڵساوە (ڕەقیبی) لە مانا کلاسیکی و بەرتەسکەکەی خۆی دەرهێناوەو گواستیتیەوە بۆ مانایەکی گەورەو بەرفراوانتر.. ڕەقیبی لەکەسێکی تاکی بەدکاری دوژمنەوە گواستۆتەوە بۆ حکومەتێکی دوژمنی دکتاتۆر یا گەلێکی شۆڤێنی داگیرکەرو دوژمنی کوردو لەبواری سیاسەت بەکاری هێناوە کە هیچ شاعیرێکی تر بەو مانایە لێی پێش نەکەوتووە کە وشەی ڕەقیبی لە قالبی سیاسی بەکارهێناوەو ئیبداعی کردووە دیارە شتی ئیبداعیش کەسانێکی زەین سادەو ساویلکە لە دژیدا دەوەستن.**

**جا دڵداریش وەکو شاعیرەکانی تر مەبەستی لە ڕەقیب هەر مانای چوارەمە کە دوژمنە وەکو کوردی شاعیر دەڵێ:**

دڵ دەڵێ (کوردی) ڕەقیب دوژمنتە کۆنە لۆتییە..

**بەلام بەمانایەکی سیاسی فراوانترو بوێرو چاونەترسانە کە ڕووبەڕووی دوژمنی گەلی کورد دەوەستێ و پڕ بەدەمی هاوار دەکاو دەڵێ:**

ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان..

**بەم هەموو بەڵگانەی سەرەوە دەرکەوت بەهیچ شێوەیەك ئەی ڕەقیب لێرەوە مانای خوا نابەخشێت وەکو هەندێ خەڵکی بێ زانیاری لەم لاو ئەولا باسی دەکەن... چونکە خوا خۆی خولقێنەرو دروستکاری مرۆڤ و گەلەکانەو ئازادی پێ بەخشیون.. وەکو عومەریش ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێ (متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا)... هەروەکو لە دەقی ئەم ئایەتانەشدا هاتووە.. ﴿ومن آياته خلق السماوات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم إن في ذلك لآيات للعالمين﴾ الروم/٢٢.**

**﴿يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير﴾ الحجرات/١٣.**

**جاچۆن لەو مەقامەدا ئەمە هەڵدەگرێ ئەگەر وای دابنێین لەجیاتی ئەوەی بڵێین ئەی ڕەقیب بڵێین ئەی خوا هەر ماوە قەومی کورد زمان.**

**خۆ خوا هیچ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ گەلی کورد نییە هەتا دڵدار یا شاعیر بڵێ ئەی خوا هەر ماوە قەومی کورد زمان... بەڵکو بەگوێرەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە باسمان کرد خوا دەفەرموێ بوونی مرۆڤەکان و جیاوازی زمان و ڕەنگ و بوونی فرە**




گەلان ئایەتی خوایەو هەر کەسێك دوژمنی زمان و گەلێکی تر بێ ئەوە دوژمنی خوایە.

کەواتە ئەم قسەو فتوا دانانە دەربارەی مارشی سروودی ئەی ڕەقیب هیچ بنەمایەکی ئیسلامی بۆ نییە. بەڵکو گەورەیی دڵدار لەوەدایە کە بەزیرەکایەتی و شاعیرانەی خۆی وشەی ئەی ڕەقیبی کە بەمانای دوژمن دێ لەمانا تەقلیدی کلاسیکییەکەی گواستەوە بۆ مانایەکی گەورەو بەرفراوانی سیاسی کە هەر مەگەر لەدەست دڵدار هاتبێ، قەناعەتیشم وانییە دڵدار کافر بێ و وتنی سروودی ئەی ڕەقیبیش کوفر بێ و بێ شارەزاو بێ ئاگا بووبێ لەقورئان!.

هەڵبەتە شاعیرانی پێش دڵدار هەموویان لە مانای ڕەقیب تێگەیشتوون و هەر لە مانا کلاسیکییەکەو لە بازنە بەرتەسکەکەی چاوەدێر لەسەر دوو دڵدار بەکاریان هێناوە... بەڵام دڵدار ڕەقیبی بۆ دوژمنی گەلی کورد یا دوو گەل بەکارهێناوە چ وەکو حکومەت یا گەلێکی دوژمنی کورد... کورد دەیەوێ بەقەڵای ئازادی بگات و سەربەخۆیی وەکو گەلان بەدەست بهێنێت، دوژمنان بوونەتە ڕەقیبی گەلی کوردو نایەڵن بەمافەکانیان بگەن.

بۆیە دەڵێین ئەگەر سروودی ئەی ڕەقیب کوفر بێ و دڵدار کافر بێ دەبێ هەرچی کەڵە شاعیرانی کوردە کافرو بێ باوەڕبن وە دیوانەکانیشیان کوفرنامە بێ و ئەدەبی کوردیش کوفری بێ...هتد

جا نازانم بۆچی ئێمەی گەلی موسڵمان وەکو گەلە موسڵمانەکانی تر ناتوانین کەڵك لە ئیسلام وەرگرین بۆ سوودی ئایین و دۆزی ڕەوای نەتەوایەتیمان، بۆچی وا سەرەڕۆیین و زوو حوکم بەسەر ڕواڵەت و ڕووکەشی شت دەدەین بێ ئەوەی لە چەمك و واتای ناوەڕۆکەکان بگەین و هەوڵی تێگەیشتن بدەین و لێی بکۆڵینەوە.

ئەو کەسانەی داوای ئیسلامەتی دەکەن چ قازانجێك لەوە دەکەن کە دڵدارو بەرهەمی شاعیرو ئەدیبانی کورد بەکوفرو بێ باوەڕی بچوێنن کە شاعیر خۆی مەبەستەکەی وانەبێت، ئایا ئەرکی سەرشانیان ئەوە نییە ئەوەی دوچاری سەرلێشواوی کافربوون هاتووە موسڵمانی بکەن یا ئەوەتە خەڵکە موسڵمانەکە کافر بکەن؟!!

چەند جوانە گەر بڵێین چۆن گەلان سروودی نیشتمانی و نەتەوایەتی خۆیان هەیە ئەوهاش سروودی ئەی ڕەقیب سروودی نیشتمانی و نەتەوایەتی گەلی کوردەو دڵداری شاعیر زۆر زیرەك و ئەقڵمەندانەو موسڵمانانەو نیشتمان پەروەرانەو ئازایانە ڕوو لەهەموو دوژمنانی گەلی کورد دەکاو دەڵێ:

ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان
نای شکێنێ دانەیی تۆپی زەمان
کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
زیندووەو قەت نانەوێ ئاڵاکەمان
ئێمە ڕۆڵەی میدیاو کەی خوسرەوین
دینمانە ئاینمانە هەر نیشتمان
لاوی کورد حازرو ئامادەیە
گیان فیدایە گیان فیدا هەر گیان فیدان
لاوی کورد هەستایە سەر پێ وەك دلێر
تا بەخوێن نەخشی بکا تاجی ژیان.

## سەرچاوەکان:

قورئانی پیرۆز، تەفسیری ئاسان، تاج الجامع الاصول، النظائر والوجوە، المنجد، المختار الصحاح، دیوانی جزیری، دیوانی بێسارانی، دیوانی نالی، دیوانی سالم، دیوانی کوردی، دیوانی مەولەوی، دیوانی مەحوی، دیوانی شێخ رەزا، دیوانی حەمدی، دیوانی حاجی قادر، دیوانی ئەخۆڵ، دیوانی بێخود، دیوانی خادم، دیوانی ئەحمەد موختار، بەشێك لە شیعرەکانی نوری، دیوانی وافی، دیوانی کەمالی، دیوانی ئەدەب، دیوانی صافی، دیوانی میرزا جاف، دیوانی زیوەر، شیعری ئانی لە دیوانی صافی، دیوانی عالّلایی (چاپ نەکراوە)، مێژووی ئەدەبی کوردی علاءالدین سجادی.




# توندڕۆو میانڕۆ، هەوڵێك بۆ شپڕزەكردنی ئایینی ئیسلام؟؟!!

**سەباح هەڵەبجەیی**

دەستبڕینەوەی دز، جەڵدە لێدان یان ڕەجمكردنی ئەو كەسانەی (زینا) دەكەن،... هتد، ئەمانە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بەڕوونی هاتووەو باسی لێوە كراوەو ڕەنگە لە سەردەمێكیشدا زۆر بەڕێكوپێكی جێبەجێ كرابێت، بەڵام ئێستا ئەگەرچی لەچەندین وڵات و لەلایەن چەندین ڕژێمی (ئیسلامی)یەوە ئەم سزایانە جێبەجێ دەكرێت، بەڵام زۆر بەشەرمەوە باسی لێوە دەكرێت و تەنانەت ئیمام و خەتیبی مزگەوتەكان و زانایانی ئایینی ئیسلام لە مەسەلەی دەستبڕینەوەو جەڵدەلێدان و ڕەجمكردن خۆیان دوور دەخەنەوەو هەوڵ دەدەن هەتا پێیان بكرێت لەم مەسەلانە خۆیان لادەن و ئەگەر ڕووبەڕووی پرسیاری خەڵكیش ببنەوە ئەوا هەوڵ دەدەن بەتەفسیری تایبەتی خۆیان بۆ ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز خۆیان لە مەسەلەكە بدزنەوە، ئەمە دوو حاڵەت دێنێتە پێشەوە:

یان ئەوەیە قەناعەتیان هەیە بەو بیرۆكەیەی كە دەڵێت هەندێك لەیاساو ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز بۆ سەردەمێكی دیاریكراو هاتوونەتە خوارەوەو تەفسیری ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ بەو شێوەیە نییە كە مامۆستایانی ئایینی ئیسلام تەعمیمیان كردووە.

یان ئەوەیە سیستمە (ئیسلامی)یەكان لەژێر گوشارو (هەڕەشەی) عەلمانیە دەسەڵاتدارەكانی ئەم سەردەمەدا ناتوانن شەریعەتی ئیسلام وەكو خۆی جێبەجێ بكەن و ناچارن لەژێر ئەو گوشارەدا خۆیان لەو یاسایانە یان ئەو بڕگانە لابدەن كە لەلای كۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە (نامرۆیی) وەسف دەكرێن، بەڵام لەناخی خۆیاندا دەست بڕینەوەو جەڵدەو ڕەجم و سزادانی ئافرەت بەو شێوەی كە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە هەموویان پێ قبووڵەو بەشوێن هەلومەرج و كاتی گونجاودا دەگەڕێن (وەك هێنانە كایەی ڕژێمێكی ئوسوڵی وەك تالیبانی ئەفغانستان بۆ نموونە)، جا ئەگەر ئەمەی دوایی حاڵەتە بلاوەكە بێت، ئەوا دەبێ كۆمەڵگای نێودەوڵەتی چاوەڕێی هەموو ئەگەرەكان بكات، بە ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕی شارستانیەتەكان و شەڕی جیهانی سێیەمیشەوە كە زیاتر ئەگەری هەڵگیرساندنی لە نێوان (ئیسلامی سیاسی و دیموكراسیەتی عەلمانی) لەپێشترە بەو حوكمەی دیموكراسیەت بەمەفهومە نوێیەكەی بەتەواوەتی ئیسلام و شەریعەتی ڕاستەقینەی ئیسلام ڕەت دەكاتەوە، یان بەلای كەمەوە بەدوو ئاراستەی دژ بەیەك كار دەكەن، بەڵام هەندێك لەبزووتنەوەو ڕژێمە (ئیسلامی)یە میانڕۆكان، بەشێوەیەكی دیكە دەڕواننە مەسەلەكەو ئەمان پێیان وانییە كە ئیسلام و شەریعەت دژی دیموكراسیەت بێت، تا ئەو ڕادەیەی دیموكراسیەت بەڕێگایەكی ڕوون و عادیلانەی گەیشتن بە بنەما شەرعیەكانی ئیسلام دەزانن، بەڵام نازانرێت مەبەست لە (توندڕۆیی یان میانڕۆیی ئیسلامی) چییە؟! ئەگەر ئیسلام یان شەریعەتی ئیسلام بریتی بێت لە قورئانی پیرۆز ئەوا دەبێ ئیسلام و شەریعەت یەك تەفسیرو یەك




ڕێگای هەبێت و نابێ ئیجتیهادو تەفسیری جیاواز لە حوکمەکانی شەریعەتدا بکرێت کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆ پێغەمبەری گەورەو سەردارمان (محمد د.خ) ناردووە.

ئەوەش دەمانگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە نابێ شتێك لەشەرعی ئیسلامدا هەبێت ناوی (توندڕۆ یان میانڕۆ) بێت و دەبێ یەك بڕیارو یەك سزا بۆ تاوانە هاوشێوەکان هەبێت. ئەو کاتەش ئیدیعای حزبە (ئیسلامی)یەکان لەفرەیی حزبیدا دەبێتە بەشێك لەنیفاق یان (مناوەرەی سیاسی) هەروەك لە تەعبیری ئەمڕۆی سیاسەتدا باوە. هەندێك دەڵێن تاقمێك هاتوونەتە پێشەوەو لەژێر فەتوای کەسانی ناو ڕێکخراوی (ئەلقاعیدە) یان وەکیلەکانی قاعیدە (کە لەزۆر شوێنی دنیادا بڵاوبوونەتەوە) شەڕێکی سەرتاسەریان لەگەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ڕاگەیاندووەو گرنگ نییە لەلایان ئایا لەم شەڕەدا سەرکەوتوو دەبن یان نا؟ بەڵکو ئەوەی لەلایان گرنگە گەیاندنی پەیامێکە کە تیایدا دەیانەوێت بڵێن، ئەوەی تائێستا لە جیهاندا بەدەست هاتووە لایەنە باشەکەیمان قبوولە ئەگەرچی زۆربەی گۆڕانکارییەکان بەعەمەلی شەیتان کراون، بەڵام زۆربەی یاساو ڕێساکان دنیایین و ناکرێت لەجیهاندا بچەسپێت، یان بەلای کەمەوە نابێ لەجیهانی ئیسلامیدا یان لەسەر خاکی ئیسلام (کە نازانرێت سنوورەکەی کامەیە؟!) پەیڕەو بکرێت.

ئەمەش پێویستی بەوەیە کەگروپ و تاقم و حزبە (ئیسلامی)یەکان حوکمڕان بن، ئێستاش حوکمڕانی بەدەسەڵات دەبێت و دەبێ دەسەڵاتداران لەحزبە (ئیسلامی)یەکان پێکهاتبن، جا ئەگەر لەم بارودۆخەدا وەرگرتنی دەسەڵات تەنها بەسندوقەکانی دەنگدان نەبێت ئەوا دەبێ شێوازی ترساندن بۆ گەیشتن بەئامانجەکان پەیڕەو بکەن، سەربڕین و خۆ تەقاندنەوەو پیشاندان و بڵاوکردنەوەی دیمەنی سەربڕین و خۆ تەقاندنەوەکەش بەشێکە لەم سیاسەتە نوێیە کە دیارە سەرانی گەورەو پلاندانەرە سەرەکییەکانی ئەم تاقم و گروپانە، مەسەلەی (ئیستیشهاد) و خۆ تەقاندنەوە نایانگرێتەوەو ناشزانرێت ئاخۆ لەشەرع و لەقورئاندا شەهادەت و خۆ تەقاندنەوە تەنها بۆ ئەندامانی خوارەوەیە، یان مافی خۆ تەقاندنەوەو گەیشتن بە (شەهادەت)، دەبێ لەسەر هەمووان جێبەجێ بکرێت؟!. بەهەرحاڵ ئێستا تاقمێك لە (ئیسلامی)یەکان جیهادیان بەڕێگای گەیشتن بەدەسەڵات هەڵبژاردووە، ئەم ڕێگایەش لەهەندێك شوێن ئیحراجیەتی زۆری بۆ موسڵمانان دروست کردووەو لە هەندێك شوێنیش بووەتە جێگای تەرەقوب و چاوەڕوانی، بەو هیوایەی سیاسەتی سەربڕین و تۆقاندن لەگەڵ بەردەوامبوونی گەندەڵی حزبە عەلمانییەکانی ناو جیهانی ئیسلامی ببێتە هۆی دوور خستنەوەی خەڵکە مرۆڤدۆستەکان لەسندوقەکانی دەنگدان، ئەو کاتەش زۆرینەی دەنگدەران لەلایەنگرانی حوکمی شەریعەت دەبێت، بەڵام ئەو شەریعەتەی کە بەتەفسیری خۆی بۆ قورئانی پیرۆز هەڵیدەبژێرێت، ڕاستتریش وایە بڵێین ئەو یاسایانەی کە لە بەرژەوەندی بەردەوامبوونی دەسەڵاتیدایە.

**ئەگەر ئیسلام یان شەریعەتی ئیسلام بریتی بێت لە قورئانی پیرۆز ئەوا دەبێ ئیسلام و شەریعەت یەك تەفسیرو یەك ڕێگای هەبێت و نابێ ئیجتیهادو تەفسیری جیاواز لە حوکمەکانی شەریعەتدا بکرێت کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆ پێغەمبەری گەورەو سەردارمان ( محمد د.خ ) ناردووە**




# بیری فەلسەفی

**وەرگێرانی- ئارام حەمید**

چەمکی فەلسەفە: وشەکە لە بنەڕەتدا لەوشەی (فیلۆس)ەوە وەرگیراوە کە مانای (خۆشەویستی) دەبەخشێ‌و، وشەی (سۆفیا) ماناکەشی (دانایی- الحکمة)یە کەواتە فەیلەسووف مانای (داناییخواز) یاخود (خۆشەویستی دانایی- محب الحکمة) دەگەیەنێ.

## سەرچاوەکانی فەلسەفەی ئیسلامی

١- قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (د.خ)، کاتێ ئیسلام دەرکەوت پلەو پایەی دانایی‌و زانست و زانیاری بەرز کردەوە، یەکێ لەگرنگترین ئامانج و مەبەستەکانیشی گۆڕین و گواستنەوەی عەرەبەکان بوو لەژیانی جاهیلیەت و نەفامییەوە بۆ ژیانێکی تازە بنەڕەت و بناغەکەی ئایینی دروست و ڕاشکاو و زانست و زانیاری بەسوود بوو، ئەمەو قورئانی پیرۆز لەزۆر شوێندا ئاماژەی بەو داناییە کردووە کە پێغەمبەر (د.خ) پێی ڕەوانەکراوە بۆ ئەوەی فێری خەڵکی بکات. پێغەمبەریش خەڵکی سازو ئامادە دەکرد بۆ زانین و ئیستیعابکردنی ئەو داناییە تاوەکو بیانکاتە نەتەوەیەکی خاوەن زانست و شارستانیەت بۆیە داوای لێ کردن و هانی دان بۆ گەڕان بەدوای زانست و زانیاری.

٢- بەیەکگەیشتنی بیری موسڵمانان بەهزرو بیری مەسیحی لە دیمەشق و بەفەلسەفەی گریکی لە بەغدا.

دیمەشق شارێکی کۆن و دێرین بوو لەبواری ڕۆشنبیریدا، هەر وەك کاریگەری گریکی تیایدا بەهێز بوو، ئەمەو پەیوەندی لەنێوان موسڵمانەکان و مەسیحیەکاندا تەنها تایبەت نەبوو بەبواری بازرگانی و کارگێڕی بەڵکو تێپەڕی کرد بۆ ئاڵوگۆڕکردنی هزریی (التبادل الفکري) لەنێوان هەردوولایاندا. ئەمەش چالاکیەك و بزاڤێکی مشتومڕانی لێ کەوتەوە لەنێوان بیرمەندان و موسڵماناندا، بەتایبەتیش سەبارەت بەدوو پرسی گرنگ ئەوانیش پرسی (قەزاو قەدەر) و پرسی (خلق القرآن). بەڵام گرنگترین ڕووداو لەپێکهێنانی هزرو بیری فەلسەفی ئیسلامیدا، بریتییە لە بەیەکگەیشتنی بەفەلسەفەی گریکی لە بەغدا لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خەلیفە مەئموندا کە پەرتووکی تایبەت بەبواری فەلسەفەی هێنا لەوڵاتی ڕۆمەوەو وەرگێڕە سریانیەکانیش بەشێوەیەکی تایبەتی وەریانگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

٣- ڕۆڵی ڕاڕەوە فیقهییەکان و مەڵبەندە زمانەوانییەکان: چالاکی ڕاڕەوە فیقهییەکان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی، بەتایبەتیش کاتێ ئەو ڕاڕەوە فیقهییانە هەوڵیان دا بنەماکانی فیقە، هەروەك ناکۆکییە زمانەوانییەکان لەنێوان قوتابخانەی کوفەو قوتابخانەی بەسرە بوونە هۆی دانانی ژمارەیەك لە وتەو دەستەواژەکان لەگەڵ چەندین دەستەواژەو بابەتی زمانەوانی ورد، فەلسەفە لەم شتانە سوودی وەرگرت.

٤- خودی فاکتەری هزری‌و بیری ئیسلامی: هزرو بیری ئیسلامی هەڵسا بەپیادەکردنی دژە بزاڤێکی بەرگری‌و بەرپەرچدانەوە بۆ ئەو ڕا و بۆچوونانەی هەڕەشەیان لە عەقیدەی ئیسلامی دەکرد،





کۆمــەڵێکیش لــە بیرمەنــدانی موســڵمان ئەوانــەی ئاگاداری فەلسەفەی گریکی بوون هـەوڵیان دا وزەو تواناکـــانی عـــەقڵ لەخزمـــەت سەرخســـتن و پاڵپشتیکردنی عەقیدەکەی خۆیان دابنێن، بەمـەش ئـەو هۆکـارو چـەکانەیان لەدەسـتی دوژمـن و نـەیارەکانی خۆیـان دەرهێنـاو ئاراستـەیان کـردن، لــەڕیزی پێشــەوەی ئــەم کۆمەڵەیــە، کۆمەڵــەی (المعتزلـة) بـوون ئەوانـەی هـەوڵیان دا پرەنسـیپ و بنـەماکانی عەقیدەکـەی خۆیـان لـە وێنـەو فۆرمێکی جیاوازدا کە عـەقڵی خۆیـان قبـووڵی بکات ئەمـەش وای لــێ کــردن بکەونــە ڕووبەڕووبوونــەوە لەگــەڵ ئەهلی سوننەت.

## شوێنەوارو نیشانەکانی بایەخپێدانی موسڵمانەکان بەفەلسەفە

١- دەرکـــەوتنی زۆرێـــك لـــە فەیلەســـووفە موســڵمانەکان ئەوانــەی کاریگەرییــەکی ئاشــکراو ڕوونیــان هــەبوو لــە هــزرو بــیری ئیسلامیدا.

٢- هەنـدێك لـە خەلیفـەکان و، هەنـدێك لـە زانایـانی موسڵمانان، پێیــان وابــوو فەیلەســووفەکان دەیانەوێ گومان و دوودڵی بخەنە نـاو هـزرو دڵ و دەروونـی خـەڵکی سەبارەت بەئایین و عەقیدەکەیان، بۆیـــە دەســـتیان کـــرد بـــــــەڕاوەدوونانیان و دژایـەتیکردنیان، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەنـدێك لـە خەلیفـەکان پاڵپشـت و پشـتگیرییان دەکـردن و هانیـان دەدان لەســـــەر گفتوگـــــۆو ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕای زانستی.

٣- زانایان زانست و ئاینیان پێکەوە گرێ دا و، بنـەماو بناغـەکانی فەلسـەفەی ئیسـلامییان دانـاو، زانستی (علم الکلام)یان لەسەر دامەزراند بۆ ئـەوەی بەڵگـــەیان بـــەهێز بـــێ ســـەبارەت بـــەپرس و کێشەکانیان بەتایبەتیش گفتوگۆی مەزهەبی.

٤- زانایـــــانی موســـــڵمانان بنـــــەماکانی دەروونزانییــان دانــا، لەســەر ئــەویش پــەیڕەوو ڕێبازەکانی خۆیان سەبارەت بەپەروەردەو فێرکردن دامەزرانـد کـە ئـەم پەروەردەیـەش هـەوڵ دەدات بـۆ پاککردنــەوەی دڵ و دەروون. ئــەلێرەدا تێبینـــی دەکـەین زانایـانی موسـڵمانان و فەیلەسـووفەکانیان بەپـــەروەردە لەســـەر بناغەیـــەك لەزانســـتی دەروونناســی دانــا، باشـترین نموونـەش بـۆ ئـەوە حجة الاسلام (الامام الغزالي)یە کە لە پەرتووکەکەی خۆیـدا چـەندین بنـەماو ڕێبـازی دانـاوە هەریـەك لەمامۆستاو قوتابی لەسـەری دەڕۆن کە هـیچ کـەمتر نییـە لـەو تیـۆرە تازانـەی لـە زانسـتی پـەروەردەدا بوونیان هەیە.

> چالاکی ڕاڕەوە فیقهییەکان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی، بەتایبەتیش کاتێ ئەو ڕاڕەوە فیقهییانە هەوڵیان دا بنەماکانی فیقە، هەروەك ناکۆکییە زمانەوانییەکان لەنێوان قوتابخانەی کوفەو قوتابخانەی بەسرە بوونە هۆی دانانی ژمارەیەك لە وتەو دەستەواژەکان

## بەناوبانگترین فەیلەسووفە موسڵمانەکان

١- یەکەم کەس کە بایەخی بە فەلســەفە دا (عەبـدوڵڵای کـوڕی موقـەفع)ە، کـە ڕەنگـە پەرتووکـە فەلســــەفیەکانی ئەرســــتۆی لەگریکییــەوە وەرگێڕابێتــە ســەر زمانی عەرەبی، بەڵام ئەو هـیچ ڕاو بۆچــوونێکی فەلســەفی لــەپاش مردنی دەرنەکەوتووە.

٢-ئــەبو یوســفی یــەعقوبی کـوڕی ئیسـحاقی کنـدی، یەکێکە لــە گـــەورەترین فەیلەســـووفە




موسـڵمانەکان، ڕەچـەڵەکەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ پاشـاکانی (کنـدە)، پلـەو پایـەکی بـەرزی لـەلای خەلیفـەکانی سـەردەمی عەبباسـییەکان هـەبوو، لەسەر پەیڕەو و ڕێبازی ئەرستۆ دەڕۆیشت، هەوڵی دا ڕاو بۆچـوونی هەریـەك لەئەرسـتۆو ئـەفلاتون پێکـەوە گـرێ بـدات، ئەمـەو چـەندین پـەرتووکی هـەبوو، وەك (التوحید) ناسـراوە بـە (فم الذهب) و (اثبات النبوة).

## فەلسەفەی کندی بەم بیرو بۆچوونانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە

أ- ژمارەکـان لـەخودی خۆیانـدا وردو بـێ شومارن، زنجیرەی ژمارەکان لە هزرو ئەندێشەماندا وردو بێ شومارەن، چونکە دەتوانین بەکۆکردنەوە یاخود بەدوو ئەوەندە کردن ژمارەیەك زیاد بکەین، بەڵام ژمێردراوەکان وردو بێ شومارن چونکە ئەوان تـەنی (اجسـام)ن و چـونکە شـتی مـاددیی و دروستکراو (مخلوق)ن.

ب- زانیـاری (المعرفـة) لـە ڕێگـەی عـەقڵ و لـە ڕێگەی هەستەوەرەکانەوە دەبێ، هـەروەها لەڕێگەی خەیاڵ و ئەندێشەوە کە پلەیەکی ناوەندییە لەنێوان ئاوەز و هەستەوەرەکاندا.

ج- هەموو تـەنێك وردو بـێ شـومارە لـە شوێن و کاتدا، تـەنیش بەشێکە لە سروشت و سروشتیش بریتیـە لـە بـوونی گـۆڕاو پەیوەسـت بـەهۆکارەوە (السببیة).

٣- ئـەبو بـەکر محەمـەد کـوڕی زەکـەریای ڕازی: لـە بـواری پزیشـکیدا (جالینۆسـی عـەرەب) بـوو، لـە فەلسـەفەدا (فەیلەسـووفی ئیسـلام) بـوو، لـە دەوروبەری خۆیدا چەندین بارودۆخی کۆمەڵایـەتی شـپرزەو دژواری بەرچـاو دەکـەوت بەتایبـەتی لـە سـەردەمی عەبباسـی یەکـەم و دووەمـدا، هـەروەها ئەو ڕابواردن و دیـاردە دزێوانـەی لـە کۆمەڵەکەیدا باو بوون. ئەبو بەکری ڕازی پزیشك و فەیلەسووف بوو زۆر باش هەستی بەوە کردبوو کە ئادەمیزاد ناتوانێ بگاتە حەقیقەت ئەگەر عـەقڵ و ژیری خۆی لەهەواو ئارەزوو دانەماڵێ. ئەلێرەوەدا ئـەبو بـەکری ڕازی جەخت لەسـەر دوو شـت دەکاتـەوە، ئەوانیش (عقـل)- هـزرو ژیـرو (الهـوی)- حـەزو ئـارەزوو. (الهـوی) لـەرووی ڕوحـی و جەسـتەییەوە زیـان بـەئادەمیزاد دەگـەیەنێ، تـەنها عـەقڵ دەتـوانێ سەرکوتی بکات.

ئەبو نەسر محەمەد کوڕی ترخان فارابی: لەسەر دەستی (ئەبی بشر کوڕی یونس حەکیم) لەبەغدا، پاشـان چـوو بـۆ (حـران) لـەوێش لـۆژیکی لەسـەر دەسـتی یۆحنـا کـوڕی حـیلان حـەکیم، پاشـان گەڕایەوە بەغداو بەشێك لە کاتەکەی خۆی تـەرخان کرد بۆ خوێندنی فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی و، فەلسـەفەی ئەرستۆ بەشێوەیەکی تایبـەتی. فـارابی نازنـاوی (مامۆسـتای دووەم)ی پـێ بەخشـرا، بـۆ ئـەوەی جیـا بکرێتـەوە لـە (ئەرسـتۆ) کـە بـە (مامۆستای یەکەم) ناسرابوو.

فـارابی لـە پەرتووکەکانیـدا بابەتـە فەلسـەفی و ئایینی و سیاسییەکانی باس کردووە، لە پەرتووکە بەناوبانگەکانیشی:

احصاء العلوم، ما ینبغي ان تعلم قبل الفلسفة، اغراض ارسطو في کتاب ما بعد الطبیعة، مقالة في العقل، تحصیل السعادة، آراء اهل المدینة الفاضلة، السیاسة المدنیة.

٤- کۆمەڵـەی ئیخـوان صـفاو خـلان وفـا: ئـەم کۆمەڵەیە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەرکـەوت، شـوێنی دەرکەوتنیشـیان بـەپێی زۆربـەی ڕاو بۆچـوونەکان شـاری بەسـرە بـوو. ئـەم کۆمەڵەیـە شێوەی کۆمەڵەیەکی نهێنـی بوون بەڕێگـەی نامـەی





زانستییەوە بیرو باوەڕەكانی خۆیان بڵاو دەكردەوە بێ نووسینی دانەرەكانیان، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی هەندێكیان ئاشكرا بووە بۆمان وەكو (ابو سليمان محمد كوڕی معشر السبتي) و (ابو الحسن علي كوڕی هارون الزنجاني)و (ابو احمد المهرجاني)و (العوق)و (زيد كوڕی الرفاعه)وە، ئەو هۆیەی پاڵی پێوە نابوون تا كارەكانیان بەنهێنی ئەنجام بدەن ئەوە بوو كە گشت خەڵكی و بەتایبەتیش ئایندارەكان زۆر ڕقیان لە فەلسەفەو فەیلەسووفەكان دەبۆوە، هەوڵیان دەدا زەرەرو زیان بەفەیلەسووفەكان بگەیەنن.

## بیرو باوەڕەكانی ئیخوان صفا و خلان وفا

١- ڕێگەی گەیشتن بەخودا، ئەم كۆمەڵەیە دەڵێن گوایە ناسین، بەتایبەتیش ناسینی دڵ و دەروون گرنگترین ڕێگەو هۆكارەكانی ڕزگاربوون و ئازادبوونی دەروونە لەكۆت و بەندو زیندانی ماددە، ناسین (المعرفة) ئادەمیزاد دەگەیەنێ بەخۆشەویستی خوداو خۆ ئامادەكردن بۆ دیدارو بینینی، ئەوەش بەگوێرەی بۆچوونی ئەوان ڕادەوەستێ لەسەر پێكهاتەی جەستەیی و كەش و هەواو پەروەردەو كاریگەری هەسارەو ئەستێرەكان، جا ئەگەر هاتوو ئەم چوار هۆكارە گونجاو بوون ئەوا دەروون بەسەر سروشتە جەستەییەكەی خۆیدا زاڵ ببێت و بگات بەپلەی ئاسوودەیی فیكری و گەیشتن لەكۆتاییدا بەپلەی (الناموس) ئەوەش پلەی پاكان و فریشتەو پێغەمبەرەكانە.

٢- نظرية الصدور: ئەم كۆمەڵەیە پێیانوایە خودای گەورەو میهرەبان لەنوری وەحدانییەتی خۆی جەوهەرێكی خوڵقاندووە پێی دەوترێ (عەقڵی چالاك- العقل الفعال)، پاشان (النفس الكلية)ی لەنووری ئەم عەقڵە دروست كردووە، لەبزاڤی ئەم دەروونەش ماددەی دروست كرد، لەم ماددەیەش گشت بوونەوەرەكانی دیكەی دروست كرد ئەم جیهانەش یەكە یەكە، یەك لاشەو تەنی هەیە. یەك دەروونیشیان تێدا دەسووڕێتەوە، وەك چۆن لەلاشەی هەر ئادەمیزادێكدا یەك دەروون هەیە بەگشت بەشەكانی لاشەكەیدا.

**فەلسەفەی ئیسلامی هەوڵی دا نێوانی ئایین و عەقڵ ڕێكبخات و لەیەكتریان نزیك بكاتەوە. بەو مەبەستەی سیفەت و خەسڵەتێكی زانستی بەئایین ببەخشێ**

لە بەناوبانگترین فەیلەسووفەكانی ڕۆژئاوای ئیسلامیش، وەك ابن ماجە، ئەویش لەسەر ڕێنماییەكانی فارابی ڕۆیشتووەو هەڵسا بەڕاڤەكردنی فەلسەفەی ئەرستۆ، پەرتووكەكەشی (تدبير المتوحد) نەگەیشتۆتە دەستمان، هەروەها (ابن جابیرۆل) كە بە (ئەفلاتۆنی جوولەكەكان) ناسراوەو پەرتووكێكی هەیە بەناونیشانی (ينبوع الحياة) هەروەها (ابو بكر ابن طفيل) دانەری ڕۆمانی (حي بن يقظان)، پاڵەوانەكەشی (حي) بوو، لە دوورگەیەكدا دەژیا كەسی تێدا نەدەژیا و هیچ پەیوەندییەكی بەدانیشتوانی دوورگەكانی دیكەوە نەبوو، ئەوە بوو بەهۆی پشتبەستنی بەخۆی، بەعەقڵ و هێزی خۆی دەستی كرد بەگەڕان و پشكنین تاگەیشتە باوەڕهێنان بەخودای پەروەردگارو مەبەستەكەشی لەوە ئەوەیە ویستی ڕوونی بكاتەوە كە شەرع لەگەڵ عەقڵ دەگونجێ. (ابن رشد)یش ئەو زانایە هەڵسا بەڕاڤەكردنی




راسپاردەو ڕێنماییەکانی ئەرستۆ کە بەگەورەترین فەیلەسووفەکانی لەقەڵەم دەدات، هەروەها ابن رشد بەرگری لە فەلسەفە کرد ئەویش لە پەرتووکی (تهافت التهافت)دا، زۆر بەتوندی وەڵامی ئیمام غەزالی داوەتەوە.

ابن رشد لە چەند پەرتووکێکی دیکەدا روونی کردەوە کە فەلسەفە لەگەڵ ئاییندا دژ یەك نین، هەروەها پەرتووکێکی بچووکی لەم بوارەدا نووسیوە ناوی لێنا (فصل المقال فیما بین الشریعة والفلسفة من الاتصال)، هەروەها بایەخیشی بەبزاڤی (الزندقة) داوە، ئەوە بوو لەسەردەمی دەوڵەتی الموحدین لەمەغریب و ئەندەلوسدا پەرتووکە فەلسەفییەکانی سووتێنران و پەرتووکە پزیشکی و بیرکارییەکانیشی بەسەلامەتی مانەوە.

## خەسڵەتەکانی فەلسەفەی ئیسلامی

١- فەلسەفەی ئیسلامی بایەخی دا بەزانین و لایەنەکانی تایبەت بەدەروون و بوون، بۆ نموونە لەم نامانەدا کە هەریەك لە ابن سیناو فارابی و کندی سەبارەت بەعەقڵ دانراون دەبینین شیکردنەوەیەکی ورد ئەنجام دراوە بۆ توانستە جۆر بەجۆرەکانی دەروون و ئەو قۆناغانەی پێویستە تێیدا تێپەڕ بێ.

٢- فەلسەفەی ئیسلامی هەوڵی دا نێوانی ئایین و عەقڵ ڕێکبخات و لەیەکتریان نزیك بکاتەوە. بەو مەبەستەی سیفەت و خەسڵەتێکی زانستی بەئایین ببەخشێ، واتە هەوڵی دا بونیادو پەیکەری فەلسەفە دابمەزرێنێ. بەم شێوەیە خەسڵەت و سیفەتێکی بەفەلسەفەی گریکی بەخشی پێشتر لەلای گریکەکان ناسراو نەبوو. ئەوەش زۆر بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێ لە نووسینەکانی ابن سینا بەتایبەتیش پەرتووکە ناودارەکەی لە بواری دەروونناسیدا.

٣- فەلسەفەی ئیسلامی هەوڵی دا ببێتە حیکمەت و دانایی، چونکە ابن سینا و فارابی و ابن رشد بڕوایان بە (وحدة المعرفة) هەبوو کە لووتکەکەی زانستەکانی (الالهیات) بوو. فارابیش لە پەرتووکەکەی خۆیدا (احصاء العلوم) زانستە جۆراو جۆرەکان سەرژمێر دەکات و باسیان لێوە دەکات و لەکۆتاییشدا باسی فەلسەفە دەکات کە ترۆپك و سەر لووتکەی زانستەکانە، هەروەها ابن سیناش لە پەرتووکەکەی خۆیدا (الشفاء) واتە شیفا و چاکبوونەوەی دەروون لەجەهل و نەزانین. بەم شێوەیە زانستەکان ڕیزبەند دەکات المنطق، الطبیعیات، الریاضیات، الالهیات.

٤- فەلسەفەی ئیسلامی یەکەیەکی حاشا هەڵنەگر پێکدێنێ وێڕای ئەو شوێنانەی تێیدا دەرکەوت و ئەو نووسین و دانراوانەی لەبارەیەوە نووسراون چ لەرۆژهەڵات یان رۆژئاوای جیهانی ئیسلامی.

٥- فەلسەفەی ئیسلامی بەشێك بوو لەڕەوتی هزرو بیری گریکی لەگەڵ بڕوای پتەو بە (وحدة الحکمة)و بەبوونی جۆرێك لەئیلهام لەلای فەیلەسووفە کۆنەکان و سرووشی (الوحی) ئیسلامیش جۆرێکە لەدرێژە پێدانی ئەو ئیلهامە. فەیلەسووفە ئیسلامییەکان حەزیان دەکرد بەدڵسۆزی بمێننەوە بۆ ئەو جۆرە کلتوورە.

## کۆمەڵەی موعتەزیلە

سەبارەت بەڕەگی ناوی کۆمەڵەی (المعتزلة) مێژوونووسان بیروڕای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان ناوەکە دەگەڕێننەوە بۆ (واصل بن عطا) کاتێ لەگرووپی حەسەنی بەسری دوورکەوتەوەو خۆی لەسووچێکی مزگەوتی بەسرەدا گۆشەگیر کردو گرووپێکی تایبەت بەخۆی دروست کرد. دوای ئەو پرسیارەی لە حەسەنی بەسری کرا، کە ئەو کاتیش پرسیارەکە خەڵکانێکی زۆری سەرقاڵ کردبوو




**فەلسەفەی ئیسلامی بەشێك بوو لەڕەوتی هزرو بیری گریکی لەگەڵ بڕوای پتەو بە (وحدە الحکمە)و بەبوونی جۆرێك لەئیلهام لەلای فەیلەسووفە کۆنەکان و سرووشی (الوحی) ئیسلامیش جۆرێکە لەدرێژە پێدانی ئەو ئیلهامە**

ئەویش ئەوە بوو: ئایا ئەنجامدەری گوناهی گەورە بەکافر، یان ئیماندار لەقەڵەم دەدرێ؟ ئەوەبوو واصل فەتوای دا کە ئەو کەسە نە کافرەو نە ئیماندارە، بەڵکو لەناوەڕاستی ئەو دوو پلەدایە. هەندێکی دیکە وای دەبینن کە موعتەزیلە لە (اعتزال)ەوە هاتووە، چونکە ئەم کۆمەڵەیە خۆیان گۆشەگیرو دوورە پەرێز گرت و بیروڕایەکی نوێیان داهێنا. هەندێکیان گوتیان کە موعتەزیلە بەزوهد ناسراون، بەهەر حاڵ زۆرێك لە موعتەزیلەکان بەم ناوە ڕازی نەبوون بەڵکو خۆیان بە (اهل العدل والتوحید) ناوزەد دەکرد.

## بنەماکانی کۆمەڵەی موعتەزیلە

١- ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات نەکافرەو نەئیمانداریشە، بەڵکو فاسقە شایانی چوونە نێو ئاگرە، بەوەش سزاو ئازارەکەی لەڕۆژی دواییدا کەمتر دەبێت لەسزاو ئازاری کافر.

٢- فەرمانکردن بەچاکەو دوورخستنەوە لە کاری ناڕێك و نابەجێ. ئەم بنەمایەش لەلایەن موعتەزیلەکان بنەمایەکە ڕێساو فۆرمی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئیماندار دیاری دەکات لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا. ئەم کارە پێویستی بە بەرگری و ڕووبەڕوو بوونەوەی خراپەکارییە بەدەست یان بەزوبان یان بەدڵ. بۆیە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان جیهادکردن لەجەنگداو لەنێوان بەرپەرچدانەوەی کافران و لەئایین دەرچووەکان (الفاسقون).

٣- دادپەروەری، موعتەزیلەکان ڕوونیان کردۆتەوە کە ئادەمیزاد ئازادە لەو کارانەی ئەنجامیان دەدات لەپێناوی ئەوەشدا لەسەر کردەوەکانی سزا دەدرێ، ئەوەش دادپەروەرییە، چونکە خەڵکی خۆیان کردەوەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتانی خۆیان دەخوڵقێنن و ئەوانیش لەو پێناوەدا خەڵات و دڵخۆش دەکرێن یان سزاو سەرزەنشت دەکرێن.

٤- یەکتاپەرستی، موعتەزیلەکان ڕەتیان کردەوە خودا چەند سیفاتێکی وەك بیستن و بینین و توانست و زانین و ئاگاداربوونی هەبێ، چونکە خودا چەند سیفاتێکی ئەزەلی نییە وەك زانین و توانست و ژیان و زیندەگییەکی زیادە لەزاتی خۆی، بەڵکو خودا زاناو تواناداری بەزاتی خۆی چونکە خودا یەکەو هاوتای نییەو دوورە لەو هەموو سیفاتانەی بەخشیویەتی بەبوونەوەرەکانی خۆی.

٤- موژدە بەخشین و تۆقاندن و ترساندن: واتا ئەوەی پەیوەستە بەچارەنووسی ئیماندارو سەرپێچیکارو کافر. موعتەزیلەکان بڕوایان وایە کە ئادەمیزاد دەبێ لەسەر کردەوەکانی هەردوو پرنسیپی (الثواب والعقاب) بیگێڕتەوە، ئەگەر ئیماندار مرد و تاوانێکی گەورەی کردبوو بەڵام تۆبەی لێ نەکردبوو، ئەوا شایەنی ئەوەیە هەتا هەتایە لەناو ئاگردا بمێنێتەوە، بەڵام سزاو ئازاردانەکەی سووکترە لە سزاو ئەشکەنجەکانی کافر.

٦- دروستکردنی قورئان (خلق القرآن)، موعتەزیلەکان ڕەتیان کردەوە دروستکردنی قورئان سیفەتێك بێ لە سیفەتەکانی خوداو ڕوونیان کردەوە کە قورئان وەك بوونەوەرەکانی دیکە خولقێنراوەو دروست کراوە واتە قورئان بریتییە لەپیت و دەنگ و لەڕێگەی سرووشەوە گەیەندراوە بەپێغەمبەرەکەی.





# باسمه مۆر
# (بصمة الاصابع)



سەلام کەریم سیدان

* ﴿اليوم نختم على أفواههم وتكلمنا أيديهم وتشهد أرجلهم بما كانوا يكسبون﴾ (يس- ئایەتی ٦٥).

ئەمرۆ مۆر لە زاریان ئەدەین، وە دەستیان قسەمان لەگەڵدا دەکەن و پێیان شایەدی ئەدەن بەوەی کە کردوومانە.

* ﴿حتى إذا ما جاؤوها شهد عليهم سمعهم وأبصارهم وجلودهم بما كانوا يعملون﴾ (فصلت- ئایەتی ٢٠).

تا کاتێ کە دێنە نزیك ئاگر کە گوێ‌و چاوو پێستی لەشیان بەکارێ کە کردوویانە شایەدیان لەسەر ئەدەن.

* ﴿أيحسب الإنسان ألن نجمع عظامه * بلى قادرين على أن نسوي بنانه﴾ (القيامة- ئایەتی ٣-٤).

ئایا مرۆڤ وا دەزانێ ئێسك و پرووسکی قەت کۆ ناکەینەوە، بەڵێ بەتواناین کە (تەنانەت خەتی سەر) تبلیشی راست و ڕێك و پێك بکەین.

ئەم دەقانەی سەرەوەی قورئانی پیرۆز گەواهیدەرن لەسەر چەند ئیعجازێکی تری خودایی کە بۆ ئێمە بووەتە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە لە دادگاکاندا پاش ئەوەی لە زانکۆ و تاقیگەو دەزگا تایبەتیەکاندا چەندین لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی بە بەهای لەسەر کراو ئەنجامی سوود بەخش‌و مژدەی شادی لێ کەوتەوە بۆ ئایندەی پڕ جەنجاڵ و گرێ کوێرەی کۆمەڵایەتی‌و ئاریشەی ئابووری بۆ دانیشتوانی سەر گۆی زەوی.

هەر چەندە وردەکاریەکانی باسمە مۆر (بصمة الاصابع) و ئەو تۆڕە سەر سوڕهێنەرەی پەنجەکان و ناو لەپ و بنی پێیەکانی داگرتووە بریتین لە کۆمەڵێك خەتی هاوتەریبی لەتەك یەکتر یەکیان بەرزو ئەوی تریان چاڵە وە بەم جۆرە ئەم دەقە قورئانیانەی کە سەرمەشقی ئەم گوتارەیە بووە مایەی گرنگی پێدانی زانایان و پسپۆران و شارەزایانی لێکۆڵینەوە نێو دەوڵەتیەکان و وەئاگای هێنان بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەم وردە خەتانەی کە ئەم تۆڕە ئاڵۆزەی پێ چنراوەو شیکردنەوەو راڤەکردنی ئەو دەرهاویشتانەی کە لەناو مەساماتەکانی ناو خەتەکاندا دەردەهاویشترێت پاشماوەی سێبەری پەنجەکان و دەست و قاچی لێ بەجێ دەمێنێ.




## خاسیەتەکانی باسمە مۆر

باسمە مۆر وەك کەرەسەیەکی بنچینەیی بۆ لێکۆڵینەوەی دادگایی بەکاردێت لەبەر ئەوەی ئەم شێوازە تۆرە هەمیشە بەجێگیریو نەگۆری دەمێنێتەوە بەدرێژایی ژیان و بگرە لەدوای مردنیشی بەماوەیەکی دوور، وە ئەوەی جێی سەرنجە ئەم شێوە خەتانە لەتەمەنی ۱۲۰ رۆژی کۆرپەلە کە لە سکی دایکی دایە دروست دەبێت بەتەواوی. وەخاسیەتی دووەم ئەوەیە ئەم تۆرە خەتانە کە نەخشەی باسمەی پێك هێناوە لەنێوان هیچ کەسێك و کەسێکی ترو بگرە لەناو خێزان و هەتا لەنێوان (جمك)یشدا وێك ناچن ئەمە بووە ناسنامەیەکی تایبەتی بۆ ئادەمیزاد.

گەلێ بیردۆز هاتنە مەیدان بۆ والآکردنی بازنەی کارکردنی ئەم زانستە بیردۆزی باسمە پەنجە-ی ناو لەپ، بنی پێیەکان، ددان، چۆك، لێوەکان و گوێیەکان دوا بەدوای ئەمانەش بیردۆزی ئەلکترۆنی بۆ تۆمارکردنی سەرجەم باسمەکانی سەر تەنەکانی شوێنی رووداو ئینجا بەشێوازێکی هونەری لەسەر راسپاردەی شارەزا جیا دەکرێنەوە.

باسمەکان وەك باس کراون لەیەك ناچن و پۆلێن کراون پاش ئەوەی ئەم باسمانە بەرێگایەکی هونەری لەشوێنی خۆیدا وێنەکەی هەڵدەگیریۆ بۆ هەنگاوی دواتر کە (مضاهاة)ە واتە کرداری بەراوردکردن.

پۆلینەکانیش

ا- گروپە کەوانەییەکان **Arches**

ب- گروپە چەماوەکان (المنحدرات) **Loops**

ج- گروپە بازنەییەکان **Whorls**

د- گروپە ئاوێتە شازەکان **Double & Accidental Prints**

### گروپە کەوانەییەکان

ئەم گروپە باسمانە دەگمەنن لەچاو گروپەکانی تری وەرێژەی ٥٪ لە کۆی هەموو باسمەکان پێك دەهێنن وە بەکورتی ئەمانە بریتین لەچەند خەتێکی لێوار پەنجەو درێژ دەبنەوەو کەوانەیەك دروست دەکەن و لەناوەراستی باسمەوە بەئاسانی دەناسرێنەوە لەئەوانی تر.


شێوەی ژمارە (١)

١- کەوانەی سادە یان ئاسایی

ئەم خەتانە لە لێوارێکی باسمە درێژ دەبێتەوەو لەلایەکەی تری کۆتایی دێت لەناوەند کەوانەیەك پێك دەهێنن و وەگۆشەو چەقی نییە.

**شێوەی ژمارە (١)**

٢- کەوانەی خیوەتی Tent Arches

ئەم جۆرە باسمانە لەگەڵ کەوانەی ئاسایی جیاوازیان لەم چەند خاڵەدا هەیە:


شێوەی ژمارە (٢)

أ- لەناوەڕاستی باسمەدا خەتێکی ستوونی بە ٩٠° هەیە.

ب- خواربوونەوەیەکی (پێچ)ی تێدایە.

ج- گۆشەو چەقی هەیە.

شێوەی ژمارە (٢)

## گروپە چاماوەییەکان (مجموعة المنحدرات) The Loops


شێوەی ژمارە (٣)

ئەم گروپە زۆرترین جۆرەکانی باسمەی کەسان پێك دەهێنن وە لەکۆمەڵە خەتێکی هاوتەریبی لێواری باسمە دەست پێ دەکەن و درێژ دەبنەوەو لەناوەڕاست پێچ دەبنەوەو چەقی هەیە هێڵێکی جیاکەرەوەش لەنێوان خاڵی چەق و گۆشەدا هەیە.

شێوەی ژمارە (٣)

وە ئەم گروپە دوو لقی لێ دەبێتەوە:

### چەماوەی کەعبیریە


شێوەی ژمارە (٥)


شێوەی ژمارە (٤)

ئەم ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەشەی وەك لەم شێوەی ژمارە (٤)دا نیشان دراوە واتە ئاراستەی خەتەکانی باسمە بەلای پەنجەی گەورە (ابهام) بەڵام ئەگەر ئاراستەی پێچەوانە بوو پێی دەگوترێ چەماوەی باسك (زندیە) وەك لەشێوەی ٤ و ٥ دا.



شێوەی ژمارە (٧)



شێوەی ژمارە (٦)

### گروپە بازنەییەکان

ئەم گروپە زۆر بەربڵاوە ڕێژەی ٣٥٪ پێك دەهێنێ لە کۆی باسمەی سەرجەم مرۆڤ وە سووڕانەوەی خەتەکان کە شێوەی بازنەیەك پێك دەهێنن هەندێ جار بەئاراستەی میلی کاتژمێرەو وەهەندێ جاریش پێچەوانەیە وەشێوەی خەتەکان لەهەردوو شێوەی گروپەکانی ئاڵۆزاوی ترەو بەئاسانیش دەتوانین خەتەکانی ئەم جۆرە باسمە ببینین وە مەرجەکانی ئەم گروپە. شێوەی ژمارەی ٦ و ٧.

١- سووڕانێکی شێوە هێلکەیی یان یان بازنەیی بەئاراستەی میلی کاتژمێرو یان پێچەوانە وەخاڵێکی لە ناوەڕاست بازنەکە پێك دەهێنن.

٢- خاڵێك لە چەقی بازنەکەدا هەیە.






شێوەی ژمارە (٨)

٣- بوونی دوو گۆشە لە باسمەدا لێرەدا جیاوازی لەگەڵ گروپەکانی چەماوەکاندا هەیە ئەویش بوونی یەك گۆشە لەم گروپەو کەچی لەگروپە بازنەییەکاندا دوو گۆشە یان زیاتر هەیە.

٤- بوونی خەتێك بەلانی کەم لەنێوان گۆشەیەك لە گۆشەکان و چەق وەك لەم شێوەیەدا نیشان دراوە (٨).

وەلقەکانی ئەم گروپەش:

١- بازنە ئاساییەکان

لەم جۆرە باسمەدا دەبێت سووری خەتەکان شێوە بازنەییەکیان وەرگرتبێت وەهێڵیکی وەهمی نێوان هەردوو گۆشەکان ببڕێت یەك لە خەتە سووڕاوەکانی ناو باسمە ببڕێت.

٢-بازنەکانی خاوەن گیرفانە ناوەندەکان



شێوەی ژمارە (٩)

ئەمانە جیاوازییان لەگەڵ جۆری یەکەم تەنها لە هێڵە وەهمییەکەیە کە لە نێوان دوو گۆشەکەدا مەرج نییە سووڕێك لە خەتەکە ببڕێت.

گروپە ئاوێتە شازەکان

ئەم گروپە ڕێژەیەکی کەم پێك دەهێنن لەچاو جۆرەکانی تر وەپێکهاتەکەی بەئاسانی دەناسرێتەوەو جیا دەکرێتەوە لەگەڵ گروپەکانی تردا چونکە خاسیەتی دوو جۆر باسمە وەك ئاوێتە لەخۆ دەگرێت.



شێوەی ژمارە (١٠)

واتە دوو پۆلین لە پۆلینەکانی باسمە لەخۆ دەگرێت لەناو یەك باسمەدا.

١- هەندێ جار پێکهاتەکەی لە چەماوەو بازنەیی دروست دەبێت وە مەرج تایبەتیەکانی ئەم گروپانەی لێ دێتە دی وە تەنها وەك رایەڵەیەکی هاوبەشی لەناو یەك باسمەدان.

٢- یان پێکهاتەکە لەئاوێتەبوونی دوو چەماوە دروست بووە.

هەندێ باسمە دوو شێوەی چەماوەی لەناو یەك باسمەدان وەهەمان مەرجیان لێ دێتە دی.


شێوەی ژمارە (١١)

٣- یانیش لە چەماوەو کەوانەی خێوەتی پێك دێن.

وە ئەم زانستە وەك بەڵگەنامەیەکی کەسی بۆ مرۆڤ و ناسنامەیەکی خودایە پێش لەدایك بوونی دروست دەبێت دوای مردنیش دەمێنێتەوە بەدەیان تاوانبارو تیرۆریستان پاش مردنیان بەهۆی ئەم زانستە ناسراونەتەوەو خرانە ناو خانەی تاوانبارانی مێژوو لەهەمان کاتدا گەلێ بێ تاوان خرابوونە ناو قەفەزی گومان و بەڵام لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکاندا سەربەرزو بەرائەت بووە بەشیان.




بۆیه تادێت زانایان بایەخ و گرنگی دەدەنە ئەم زانستەو حاڵی حازر لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەکرێت بۆ تۆمارکردنی ناسنامەیەکی تری مرۆڤ ئەویش شەپۆلی دەنگەکانیەتی خودای گەورە بەخشیویەتی بەئادەمیزادی خۆی.

**سەرچاوەکان"**


١- المدخل الى علم البصمات المحامي طه كاسب فلاح الدوري- عمان ٢٠٠٦.

٢-البصمات- ضياءالدين حسن فرحان- مطبعة سامي- الازاريطه- الاسكندرية ٢٠٠٥.

٣- Latent FIngerprmts From Crème Sccne to Courtroom.


# بۆ ئاگاداری و زانین

١- لەبەر دواکەوتنی گۆڤارەکەمان لە دەرچوونیدا لەکاتی دیاریکراوی خۆی داوای بەخشین و لێبوردن لە خوێنەرانی زێدە خۆشەویستمان دەکەین.

٢- جگە لە گوتاری (سەرنووسەر) گۆڤارەکەمان بەرپرسی ناگرێتە ئەستۆ لەبەرامبەر ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە چونکە هەر بابەتە گوزارشت لە ڕا و بۆچوونی نووسەرەکەی دەکات.

٣- پێویستە گشت نووسەرانی بەڕێزی گۆڤارەکەمان بابەتەکانیان بە دەستنووسێکی جوان و لەسەریەك ڕووپەڕی قەبارە (A4) بنووسن و بۆمان بنێرن و باشترە ئەگەر بکرێت بەکۆمپیوتەر بنووسرێت یا لەسەر فلۆپی ئامادە بکرێت.

٤- هیچ کەسێك مافی داواکردن و گەڕاندنەوەی بابەتی بۆ نییە ئەگەر لەحاڵەتی بڵاونەکردنەوەش بێت.

٥- گشت نووسەران (ئەوانەی بابەتەکانیان بڵاوکراوەتەوە) پێویستە لەماوەی دوو هەفتە لەدوای دەرچوونی گۆڤارەکە سەردانی دەستەی سەرپەرشتیار بکەن بۆ وەرگرتنی پاداشتەکانیان.

**دەستەی سەرپەرشتیاری گۆڤار**




# دەستی پیرۆز

**شیعری: ادیب ابراهیم الدباغ** **و: د. زانا مستەفا مەحمود**

( بەئاوی زێڕ بینووسنەوە..

وشەکانی بە ئەڵماس بڕازێننەوە

لە پەڕەی دڵ بیپارێزن..

چونکێ زۆر زۆر هێژای ئەمەیە)

نووسیی

لەناو لەپی موحەممەددا "د.خ" بەردەکان چاویان سەر بەرەو ژێر تەسبیحاتی خودایان دەکرد..

لەنێو لەپی ویدا کانگاکانی بەزەیی ڕێچکەیان دەبەستو..

گوڵزارەکانی خۆشەویستی چرۆیان دەردەکرد..

* * *

خۆڵی بێ نرخ لەنێو لەپیا شکۆی وەرگرت..

قوڕی نزمو کەمیش پڕ ڕێزو بە قەدر بوو..

بێ هێزیی بووە بەهێزو..

وەك هێزی سوپایەکی مەزنی لێ هات..

* * *

بەردە ساردەکان کاتێك بەر لەپی پیرۆزی کەوتن..

بڵێسەی گڕیان لێ هەڵستا..

بوو بە گڕێك ڕوخساری دوژمنانی سووتاندو..

بوو بە بێڵ سەری پان کردنەوە..

بووە تاریکیی چاوانی کوێر کردنو..

باوبۆرانی هاروهاج ئێسقانەکانیانی هەنجن هەنجن کردو..

کۆمەڵیانی پرژو بڵاو و تەفرو توونا کرد..

* * *





سەرسام مەبن.. دەستی خودا لەسەر دەستی ئەوە..

ئەی هەتوانی هەموو ئازارەکان..

ئەی بەرەکەتڕێژ و..

کۆڕی پەرجووەکانو..

ڕێژاوی دەسەڵاتی خوداوەندو..

نیشانە دەراساکانی...

* * *

لەپی پیرۆزی تۆ گۆشەیی زیکرە، دەرگای لەسەر پشتە

بۆ جەمی یارانو خۆشەویستان..

فریشتەکان دەورەی دەدەن..

بەزەییش بەسەریدا باریوە..

ئەوەی لێی وەنێزیك کەوێ شەوقی بەسەردا زاڵ دەبێو

تەسبیحات دەکات..

ئەوەی دەستی بەری کەوێ عەشقی سەر ئەکاو

تەسبیحات دەکات..

هەر کەسێك چووە نێزیکییەوەو تیایدا گیرسایەوە غەریبی

دەیهەژێنێو تەسبیحات دەکات..

هەر شتێك دەست لە ملانی لەپی پیرۆزی بکات..

تەسبیحات دەکات..

تەنانەت بەردەکان تەسبیحاتیان کرد..

* * *

لەپی پیرۆزی...

کاتێك دوژمنانی گێچەڵی پێبکەن.. بەو بچووکییەی..

دەبێتە شەپۆڵی دەریا نقومی ژێر ئاویان دەکات

ئەوەندە نابات تیری تووڕەیی خوداوەند..

ساچمە ئاسای لێ دەردەچێت تا دوژمنەکان.. کوشندانە

بئەنگێوێت..

تەنانەت گەردەکانی گڵیشو وردە چەویش.. دەبنە تیری




دڵانپارو گیان دەکێشن..

* * *

خودی ئەو دەستە پیرۆزەش.. بەڕەحمەت دەگەڕێ لە

شوێنی ڕەحمەتداو..

دەبێتە هەتوانی شیفا بۆ دەردەداران‌و کانیاوی..

تریاق‌و دەردان ڕادەماڵێت‌و شیفا دێنێت.

* * *

کاتێکیش ئەو دەستە ڕادەبێت بۆ کاری گەورەو گران..

گەورەیی جەلالەتی خودا دەوری دەداو..

هەیبەتی خودا ڕەگەڵی دەکەوێ..

ئیشارەت دەکات بە مانگ‌و..

بە ملکەچی شەق دەبات‌و دەبێت بە دوو لەت

و شۆڕ دەبێتەوە تا قابە قەوسەینی لێ دێ...

* * *

ئەمە دەستی موحەممەد بوو (د.خ)..

جێ چاوی خوداوەندو.. مەیدانی موعجیزەکانی‌و..

ئاسمانی ڕۆناکییەکانی..

* * *

چ بەختێکی دڵخۆشی هەیە لەلای دروستکەری مەزن..

چ راستگۆییەکە راستگۆیی ئەو..

چ بانگەوازێکە –کە گومانی تیا نییە- بانگەوازی ئەو..

* * *

وای لە خۆشیی ئەو کەسەی دەستی بەردەستی موحەممەد دەکەوێ‌و..

ئۆخەی بەگیانی ئەوی تەوقەی لەگەڵ دەستی پیرۆزی کردووە..

ئای لە دڵشادیی ئەوانە لەپیان دەست لەملانی لەپی موحەممەد بوون..

وای لە دڵخۆشیی کەسێ ناو لەپی بەناو لەپی موحەممەد نووساو..

پەیمانی دایە گوێڕایەڵی بێت‌و تاعەتی بکات..

لە خۆشی‌و ناخۆشیدا





# بازرگانیکردن بەقورئان خوێندن لە پرسە (تازیە)کاندا



**مەحمود شێرزاد**

مەسەلەی داب و نەریتە کۆمەڵایەتی و عەشایەرگەریە پاشکەوتوو و نێگەتیڤەکان بەهۆی بەسەرداچوونی درێژایی زەمەن رەگ و ریشەی لەنێو زۆربەی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵات بەئەستووری داکوتاوە، رەنگە پرۆسەیەکی سانا نەبێت ئەگەر ئیرادە بکەین بۆ بنەبڕکردن و نەهێشتنی ئاسەوارو کاریگەری لەسەر تاکەکاندا.

بەگشتی پرسە واتە (تازیە) لەنێو کۆمەڵی مرۆڤایەتی دیاردەیەکی تازە بابەت نییەو مێژوویەکی کۆنی هەیە، ئینجا بۆ هەر یەك لە نەتەوەو میللەتانی جیهان بەپێی تایبەتمەندی و عورفی خۆیان بەڕێوە چووە، ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك هەموو بابەت و رەهەندە فیقهی و ئەحکامە شەرعیەکان ئاماژەی بەپرسەو روونکردنەوەی رێوشوێنی کردووە، بەڵکو سنوورێکی مام ناوەندی بۆ داناوە، بەڵام سەدان جار بەداخەوە لە جیهانی ئیسلامیدا هەر نەتەوەو مەزهەبێك بەگوێرەی داب و نەریتی خۆی رێورەسمی پرسە دەبەن بەڕێوە لە هەندێك شوێن و ناوچان بەپێچەوانەی دەقەکانی شەرعی ئیسلام پرسە دەگێڕن.

بەبڕوای هەموومان لەکۆمەڵگای کوردەواری پرسە قورسترین ئەرکە لەسەر شانی خاوەن مردوو بە (٣) دانە رۆژ وەستان لەمزگەوت بۆ پێشوازی لە حەشاماتی خەڵك و ئامادەکردنی ژەمی خواردن بۆ ئەو میوانانەی کۆدەبنەوە، هەروەها دابینکردنی قورئان خوێنانی پیاو و ئافرەت لەماڵ و هۆڵی پرسەدا، لەم سەردەمە گرفتێك دروست بووە لەزۆربەی کۆڕو دانیشتنەکان جێگەی مشتومڕو گفتوگۆکردنی خەڵکە لەسەری کە بەرزبوونەوەی نرخ و زۆر داواکردنی پارەو پولی قورئان خوێنانی ئافرەت و پیاوانە چونکە گەیشتۆتە رادەی (٥٠٠ تا ٨٠٠) دۆلار وەرگرتن بۆ (٣) رۆژی پرسە، ئەگەر وابڕوات لەوانەیە ئەم بڕە زۆرە دەبێتە نرخێکی جێگیر ئەو کاتە هەژاران بێ بەش دەبن لەپرسە دانان.

جاران وەك هاوکاری و یارمەتیدان ئەو قورئان خوێنانە بڕێ پارەی رەمزییان پێدەدرا، لەم سالأنی دواییە نرخی بۆ دانرا، ماوەیەکە خوێندنی قورئان لە پرسەکاندا کراوەتە کارێکی بازرگانی وشك و بازرگانی پێدەکرێت، لەکاتێکدا خوای گەورە هەڕەشە دەکات و هۆشداری دەدات کە کڕین و فرۆشتن بەئایەتەکانی خوا نەکرێت دەفەرموویت ﴿فَلا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾





**لەکۆمەڵگای کوردەواری پرسە قورسترین ئەرکە لەسەر شانی خاوەن مردوو بە (٣) دانە ڕۆژ وەستان لەمزگەوت بۆ پێشوازی لە حەشاماتی خەڵك و ئامادەکردنی ژەمی خواردن بۆ ئەو میوانانەی کۆدەبنەوە، هەروەها دابینکردنی قورئان خوێنانی پیاو و ئافرەت لەماڵ و هۆڵی پرسەدا**

(مائیدە/ ئایەتی ١٤) واتە: لەخەڵکی مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن ئایەت و فەرمانەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر نرخەکە هەموو دنیاش بێت هەر کەمە) بەهەمان شێوە لەسورەتی بەقەرە ئایەتی (٤١)دا هاتووەو دەفەرموێت ﴿وَآمِنُواْ بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُمْ وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ﴾ بەواتای: هەروەها ئیمان بهێنن بەو قورئانەی ناردوومەتە خوارەوە کە پاڵپشتی پەیامەکەی لای ئێوەیە، (تەورات و ئینجیلی) دەستکاری کراو، مەبنە یەکەم بێ بڕوا پێی (لەجیاتی یەکەم باوەڕدار) وە ئایەتەکانم بەنرخێکی کەم مەگۆڕنەوە (لەپێناوی بەدەستهێنانی هەندێ مەرامی کەم نرخی دونیا(١) تەنها لەمن بترسن و خۆتان لە خەشمی من بپارێزن.

جارێکیان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کەسێك ڕەوانەی شارێك دەکات تاوەکو ببێتە بانگبێژ لە مزگەوتێکدا بەڵام بەتوندی ئاگاداری کردەوە لە بەرامبەریدا پارەو شتی دیکە وەرنەگرێت، ئایا تاوان نییە ئەو بڕە زۆرەی پارە وەربگیرێت لە بەرامبەر خوێندنی قورئان لە پرسەدا کە سەد دەر سەد پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سوننەیە کە ڕێژەگەلێك لە زانایان دەستکەوتنی ماڵ لەڕێگەی ئایین و قورئانەوە بەڕەهایی دەیخەنە خانەی یاساغ بوونەوە نەخاسمە بۆ ئافرەتان بەهیچ شێوەیەك دروست نییە قورئان بەدەنگی بەرز بخوێنن چجای لە پرسەکان بە بڵندگۆ دەنگیان دەربخەن و داوای پارەی خەیاڵی بکەن.

هەرچەندە وەزارەتی ئەوقاف لەڕووی کەمکردنەوەی ماوەی پرسەو دانانی نرخێکی گونجاو بۆ خوێندنی قورئان لە پرسەکاندا دریغی نەکردووە، ئێستاش ئەرکی سەرشانی ئەوە کە هەڵوێست وەرگرێت و سنوورێك بۆ کێشەی بەرزبوونەوەی نرخی قورئان خوێندن دابنێت و مشووری لەو بابەتە بخوات بەهاوشانی وتارخوێنان لە مزگەوتەکاندا کە ڕۆڵ ببینن لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکی موسڵمان بە پابەندبوونیان بەو ڕێنماییە تایبەتیانەی دەردەچن کە ڕەچاوی بەرژەوەندی هەموو لایەك دەکەن.

هەنگاوێکی ئایینی و شارستانیانە دەنێین ئەگەر پرسە بکەین بەیەك ڕۆژو لە ئەرکە قورسەکانی کەم بکەینەوە ئەم بنەماڵەیە هەنگاوێکی چەند پیرۆزیان نا کە ماوەیەك لەمەوبەر ئەندامێکی سەرەکیی ماڵەکەیان کۆچی دوایی کردو پرسەیان بۆ یەك ڕۆژ ڕاگەیاند کە هەنگاوێکی زۆر بوێرو مۆدێرنانە بوو خۆزیا دەیان خێزانی دیکەی ئەم شارە بەهەمان شێوە لاساییان دەکردنەوە.

**سەرچاوەکان:**


١-تەفسیری ئاسان.

٢-سبل السلام (باب الأذان) الأمام الشوكاني.







# مامۆستا مەلا عبدالكريم
# کەسایەتی ناودارو بەناوبانگ

ئازاد عەباس گلێجاڵی

هەتاوی دونیای زانکۆی بیارە      لەپاش ئاوابوون جوانتر دیارە

**بەناوی خودای گەورەو میهرەبان**

دەستو پێنووس دەیانەوێ باسی زاتێك بکەن کە دەزانن بە هیچ شێوەیەك مافی تەواو بەو نووسینە نادەن، دەیانەوێ باس لە کەسایەتییەکی گەورەو سەربەرزی کوردستان بکەن کە نەك دەستو پێنووسی من بەڵکو دەستو پێنووسی سەدان گەورەو نووسەری تێدا گۆجو کولە، چ جای دەستو پێنووسێکی وەك من، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ لا يكلف الله نفسا إلا وسعها ﴾ عەرەبیش دەڵێ (مالايدرك كله لايترك جله) دەنا هیچ کەسێك ناتوانێ مافی تەواو بە نووسینێك بدات لەسەر کەڵە زانای گەورە جەنابی مامۆستا مەلا عبدالكريم کە لەم نووسینەدا دەمەوێ باس لە سێ لایەنی گرنگ بکەم کە:

١- کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا.




٢- مامۆستا لەدڵی نووسەرەکاندا (کە باس لە چوار نووسەری گەورەی کوردستانی رۆژهەڵات دەکەین).

٣- دانراوەکانی مامۆستا.

## ١- کورتەیەك لە ژیانی

بۆ ئەم لایەنە سوودمان لە کتێبێکی خودی مامۆستا وەرگرت (بە کورتی) کە ئەویش کتێبی (علماؤنا في خدمة العلم والدين)ە کە لەوێدا مامۆستا باس لە زانایانی کورد دەکات کە لەچەند لاپەڕەیەکیشدا باس لەژیانی خۆی دەکات.

مامۆستا ناوی عبدالکریمی کوڕی محمد کوڕی فتاح کوڕی سلیمان کوڕی مصطفی کوڕی محمدە لەساڵی (١٣٢٣ی کۆچی- ١٩٠١ی زایینی) لەگوندی تەکیەی نزیك خورماڵ لەدایك بووە، عەشیرەتەکەیان ناوی (هۆزی قازی)یە کە ئێستا لە شارۆچکەی (سەید سادق)و گوندی (مایندۆڵ)و دەوروبەری نیشتەجێن. لەمنداڵیدا دەستی کردووە بەخوێندن و قورئانی پیرۆزی خەتم کردووەو پاشان چەند وردە کتێبێکی خوێندووە، کە لەم کاتانەدا باوکی کۆچی دوایی دەکات و دایکی و مامەکانی بەخێوی دەکەن لەساڵی (١٣٣١)ی کۆچیدا دەست دەکات بە خوێندنی تەصریفی زەنجانی، پاشان چەند حوجرەیەك دەگەڕێت تا ئەوەی لەلای یەکێك لە مامۆستاکان کە هاوڕێی باوکی بووە دادەمەزرێت و پێشەکییەکانی (نحو و صرف)ی لا دەخوێنێت تادەگاتە شەرحی جامی، لەم کاتەدا جەنگی جیهانی یەکەم دەست پێدەکات، لەو کاتەدا دەچێتە سلێمانی و لەپێشدا لەمزگەوتی (مەڵکەندی)و پاشان لەمزگەوتی (مەلا حەمەمین)ی بالیکدەری لە سەرتەشەقام دادەمەزرێت ماوەیەك دەمێنێتەوە تادەگاتە (شرح السیوطي) لەکاتێکدا کە گرانییەکە دەست پێدەکات دەگەڕێتەوە بۆ هەورامان و لەخانەقای (دوڕۆ) لەکوردستانی بەردەستی ئێران کە حەزرەتی شێخ علاءالدین سەرپەرشتی دەکرد دادەمەزرێت، ئەویش وەك کوڕی خۆی بەخێوی دەکات، لەوێدا (نحو ومنطق وآداب البحث والتشريع في الفلكيات والفقه) دەخوێنێت تا لەساڵی (١٣٣٨ك) حەزرەتی علاءالدین دەچێتەوە بیارە ئەویش چەند مانگێك لە (دوڕۆ) دەمێنێتەوەو پاشان بە ئەمری حەزرەتی علاءالدین دێتە بیارە لەلای مامۆستا مەلا محمد سعید عوبەیدی دادەمەزرێت و (برهان)ی گەلەنبەوی دەخوێنێ پاشان دەچێتە لای مامۆستا مەلا محمود لە بالك لەلای ئەویش (٨) مانگ دەمێنێتەوەو فەرائضی شێخ معروف نودهی و شەرحی عقائدی لا دەخوێنێت، پاشان بە ئەمری حەزرەتی علاءالدین دەگەڕێتەوە بیارەو لەلای مامۆستا احمدی رەش دادەمەزرێت. لەوێ کتێبی شرح العقائد و عەقیدەی مەرضیەی مەولەوی دەخوێنێت و دەست دەکات بە مختصر، لەکاتی خوێندنی مختصردا مامۆستا مەلا احمد دەچێتەوە بۆ سلێمانی و مامۆستاش لەخزمەتیا دەڕوات و لەخانەقای مەولانا دادەمەزرێت کە لەو سەردەمانەدا زانای بەناوبانگ (ابن القرداغي) لەوێ مدرس بووە. مامۆستا لەخزمەت ئەودا دەمێنێتەوە لەوێدا هەردوو زانستی (اقصی الاماني) لە بەلاغەداو (الفريدە) لە نحودا دەخوێنێت و سەماعی (گوێ گرتن) برهان و التشریح و رسالة الحساب واشكال التأسيس في الهندسة وتقريب الحرام





هێمنی شاعیر دەڵێ:
**هەموو کوردێکی پاک، چاک، دیندار، دڵسۆزو ئەدەب دۆست، ئەگەر بەدڵ‌و گیان خۆی بە منەتبارو قەرزداری مامۆستای هێژاو زانای کورد مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس نەزانێ ناهەقی دەکا**

وجمع الجوامع والاسطراب والربع المجيب وحاشية اللارى دەکات‌و (المنهج) لە شەرعدا دەخوێنێت باسی (خولع)یش لە توحفەدا دەخوێنێت. پاشان مامۆستا شێخ عمر ئەمر دەفەرموێت کە ئیجازە وەربگرێت‌و ئەویش بە ئامادەبوونی چەندان مامۆستای پایەبەرزی وەك شێخ بابا علی تەکیەیی‌و شێخ محمد نجیب قەرەداغی‌و شێخ جلال قەرەداغی‌و شێخ معروف‌و مامۆستا شێخ عمر قەرەداغی ئیجازە وەردەگرێت کە ساڵی (١٣٤٣)ی کۆچی بوو، پاش ئیجازە وەرگرتن دەچێتە (نێرگسەجاڕ)و لەوێ مەدرەسەیەك دادەنێت. پاشان حەزرەتی شێخ علاءالدین دەنێرێت بە شوێنی و لە بیارە دەیکا بە مودەڕیس‌و بەهەموو جۆرێك یارمەتی خۆی‌و فەقێکان دەدات تا بەردەوام بێ لەسەر تەدریس‌و خوێندن. لەو ماوەیەدا کە مامۆستا لەوێ تەدریسی کردووە نزیکەی (٥٠) مەلای زۆر زانای ئیجازە داوە. پاشان ساڵی (١٣٧١)ی کۆچی لە بیارە بار دەکات‌و دەچێتە سلێمانی لەمزگەوتی (حاجی حان) دادەمەزرێت‌و لەوێش دەست دەکات بە تەدریس تا لەساڵی (١٣٧٤)ی کۆچی لەوێش دەگوێزێتەوە کەرکوك‌و لەتەکیەی حاجی جەمیلی تاڵەبانی دادەمەزرێت لەوێش ماوەیەك تەدریس دەکات تا کاتێك کە مەدرەسەی شێخ عبدالقادر گەیلانی بێ مودەڕیس دەبێت لەکاتێکدا کە شێخ محمد قزڵجی وەفات دەکات مامۆستا دەچێتە بەغداو ئیمتیحان دەکات‌و سەرکەوتوو دەبێت‌و لەمزگەوتی ئەحمەدی دەبێتە ئیمام‌و پاشان خوازنامە پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی کە ببێتە مودەڕیس لەمزگەوتی شێخ عبدالقادر بۆ ئەوە ئیمتیحانێکی تر دەکات‌و دەبێتە مودەڕیس (دیارە خەڵکی زۆر بەشداری ئەو تاقیکردنەوانە بوون‌و وا دەردەکەوێ کە مامۆستا لە بەغدادا پلەی یەکەمی وەدەست هێنا بێ). پاشان بە مودەڕیس دادەمەزرێت‌و لە هەموو لایەکی دونیاوە فەقێ رووی تێدەکات لەوڵاتانی وەك (جاوە، تورکیا، مەغریب، جەزائیر، لە عێراق بە کوردو عەرەبەوە) پاشان لەساڵی (١٣٩٣ کۆچی- ١٩٧٣ زاینی) خانەنشین دەکرێت بەڵام لەسەر داخوازی نەقیبەکانی بارەگای گەیلانی لەسەر تەدریس بەردەوام دەبێت. تاوەکو بەرواری ٢٠٠٥/٨/٣٠ هەر لەوێ وەفات دەکات‌و بەخاك دەسپێررێت.

## ٢- مامۆستا لەدڵی نووسەرو شاعیراندا

بۆ ئەم لایەنە مامۆستا لەلایەن زۆر گەورە نووسەرو شاعیرەوە وەسفی کراوەو هێما بۆ ئەو ئەرك‌و زەحمەتانە کراوە کە مامۆستا لەپێناو ئایین‌و کوردایەتی کێشاویەتی، بەڵام لێرەدا ئامارە بەوتەی چوار نووسەرو شاعیری گەورەی رۆژهەڵاتی کوردستانی دەکەین کە ئەوانیش مامۆستایان:

١- حەسەنی قزڵجی نووسەر، ٢- هێمنی شاعیرو نووسەر، ٣- هەژاری شاعیرو نووسەر، ٤- هێدی شاعیرو نووسەر.




١- مامۆستا حەسەن قزلّجی (١٩١٤-١٩٨٤):

**مامۆستا حەسەن قزلّجی دوو وتاری (مامۆستا مەلا کەریم هەوەڵێن تێکستۆلۆکی کورد)و (دیوانی مەحوی‌و کاری تازەی مامۆستا مەلا کەریم) بڵاوکردۆتەوە کە لەو دوو وتارە بەنرخەدا زۆری ستایشی مامۆستا کردووە لێرەدا چەند دێڕێك لەو دوو وتارە هەڵدەبژێرین.**

**قزلّجی دەڵێ مامۆستا مەلا کەریم... (زانایەکی بەرزی ئایینییە، پیاوێکی نیشتمانپەروەرەو بۆ خزمەتی ئەدەبی گەلەکەی خۆی ڕەنج دەداو هەموو کەس خۆشی دەوێ‌و ڕێزی لێ دەگرێ)، (مامۆستا مەلا کەریم هەوەڵێن "تێکستۆلۆگ"ە لەئەدەبی کوردیدا مێژووی ئەدەبی کوردی بەناوی هەوەڵێن تێکستۆلۆگەوە منەتبارییەتی‌و هەمیشە بەڕێزەوە یادی دەکا).**

**لەجێگەیەکی تر ڕوو دەکاتە مامۆستاو دەڵێ (مامۆستای بەڕێز ئەوەی کردوویەتی کارێکی زۆر بەنرخە "مەبەست شەرحی دیوانی مەولەوییە" تۆ تاقە کەسێك نی... هەر بەتەنیایی کۆمەڵە کەسێکی، وەکو لەسەرەوە گوترا لەشێوەی هەورامی شارەزای ئەوەیان یەك، لە کۆنە ڕێنووسی فارسی شارەزایی هەبووە ئەوەیان دوو، زانای ئایینیت‌و زاراوە ئایینییەکانی مەولەویت روون کردووەتەوە ئەوەیان سێ، لەسۆفیگەری ئاگاداری‌و مەتەڵەکانی ئەم دیوانەت هەڵێناوە ئەوەیان چوار، لەهونەری ئەدەبی کلاسیکی کوریدا دەوڵەمەندو نەخش‌و نیگاری مەولەویت خستۆتە بەرچاوان ئەوەیان پێنج خۆ ئەگەر لیژنەیەکیش بۆ ئەم کارە دابنرایە لە پێنج کەس تێنەدەپەڕی‌و ڕەنگە ئەم کارەشی ئاوا بە قووڵی‌و بەجوانی پێ نەکرایە)... (پیت‌و بەرەکەتی تەمەنی پیرۆزی مامۆستا مەلا کەریم جگە لەکارە بەنرخەکانی ئەوە بوو کە کوڕەکانی وا ڕاهێناوە بەڕێگای ڕاست‌و ڕەوانی خۆیدا بڕۆن‌و خێر بۆ زمان‌و ئەدەبی کوردی بدەنەوە... مامۆستا مەلا کەریم هەروەکو هەوەڵێن تێکستۆلۆگی کوردییە هەوەڵێن مامۆستاو داهێنەری کاری بە "کۆلێکتیڤ"یشە لەمەیدانی ئەدەبی کوردیدا).**

٢- هێمنی شاعیر (١٩٢١-١٩٨٦)

**مامۆستا هێمن لە ئێران پێشەکییەکی لەسەر دیوانی نالی مامۆستا مەلا کەریم نووسیوە کە لەوێدا دەڵێت:**

**(هەموو کوردێکی پاك، چاك، دیندار، دڵسۆزو ئەدەب دۆست، ئەگەر بەدڵ‌و گیان خۆی بە منەتبارو قەرزداری مامۆستای هێژاو زانای کورد مەلا عەبدولکەریمی مودەریس نەزانێ ناهەقی دەکا، چونکە مامۆستاو کوڕە کارامەو لێزانەکانی بە هەموو هێزو توانای خۆیانەوە بەهیچ بارێك لەخزمەتی کوردی چارەڕەشی دوورە بەشی هەژار درێغییان نەکردووە، بەڕاستی ئەم خزمەتە بەنرخانەی ئەم بنەماڵە چاکە بە دین.. فەرهەنگ، بە زمان، بە ئەدەب‌و ئاکاری کوردییان کردووە شایانی ئەوپەڕی ڕێزو سوپاسە)... (گەڕیدەیی‌و دەربەدەری ئەم سوودەی بۆ من هەبوو کە لەنێزیکەوە بەخزمەت مامۆستا بگەم‌و دەستی موبارەکی ماچ بکەم‌و بزانم کۆگای نورو دەریای بێ سنوورە)، (... ئەگەر هەموو نووسینە بەنرخەکانی ئەم مامۆستا کورتە باڵا ڕەزا سووکە خوێن شیرین‌و قسە خۆشە بێنی‌و لەتایەکی تەرازووی باوی‌و جەستەی لاوازی خۆشی لەتایەکەی دیکەی بخەی ئایا سەری وەمیچی حوجرەکەی ناکەوێ؟؟)... (باسی یەك یەکی نووسراوەکانی مامۆستا وەك تەفسیری قورئانی پیرۆزو شەریعەتی ئیسلام‌و... نە بەمنی بێ دەسەڵات دەکرێ‌و نە لەو کورتە باسەدا دەگونجێ. ئەم ئەرکە لە ئەستۆی مامۆستایانی ئایینی‌و شارەزایانی**




ئەدەبو پسپۆڕانی زانستە کە هیوادارم کەمتەرخەمی نەکەنو شوێنەوارە بەکەڵكو باشەکانی مامۆستا پتر بەخەڵك بناسێنن...).

٣- هەژاری شاعیرو نووسەر (١٩٢٠-١٩٩١)

رۆژنامەی کەیهانی فەرهەنگی ئێران لەچاوپێکەوتنێکدا کە لەگەڵ مامۆستا هەژاردا سازی دابوو لێیان پرسیوە کە (لەناو نووسەرەکانی کورد یانی ئەوانەی تەنها بە پەخشان دەنووسن کامیانت لاپەسەندە؟) مامۆستا لەوەڵامدا فەرموویەتی (ئێمە نووسەری ناوبەدەرو بەناوبانگمان زۆرە کە لێرەدا ناتوانم هەموویان دەستنیشان بکەم، بەڵام دەتوانم ناوی نووسەری ناودار مامۆستا عبدالکریمی بیارە ناسراو بە مدرس ببەم (کە ناوی چوار نووسەری تر دەبات).

٤- هێدی موکریانی شاعیرو نووسەر (١٩٢٧- لەژیاندایە)

یەکێك لە ئاواتە گەورەو مەزنەکانی مامۆستا هێدی ئەوە بوو کە دیوانەکەی وەبەرچاوی مامۆستا مەلا عبدالکریم بکەوتایەو شتێکی لەسەر بنووسیایە بەڵام سەد حەیفو مەخابن کە ئەو ئاواتە بەرزەی وەدی نەهات مامۆستا لەپێشەکی دیوانەکەیدا (کاروانی خەیاڵ) دەڵێت:

(ئەریٚ تۆ بڵێی من کە لەژیانمدا لە نەهامەتیو چەرمەسەریٚ بەولاوە چیترم نەدی بەمردوویی شانس رووم تیٚ بکاتەوەو، ئەم دیوانە بیٚ سەرو بەرەم رۆژێك لەرۆژان بکەوێتە بەردەستی لێوەکوڵ و زانای پایەبەرزی هاوچەرخ مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس کە بە بیری بەرزو خامەی زێڕینی خۆی دەستی تیٚ بگێڕیٚو گیانێك وەبەر دێڕە سیسو مردوولەکانی بێنیٚ؟ خوایە ئەو تەمەنە درێژە بەو زانا مەزنەو ئەو بەختەوەرییە گەورە بەهێدی رەوا ببینی).

## ٣- دانراوەکانی مامۆستا

مامۆستا مەلا عبدالکریم لە تەمەنی پڕ بەرەکەتی خۆیدا جگە لەوەی سەرقاڵی دەرس وتنەوە بوو بە فەقێیان بەڵکو بەگەورە زاناکانیش هەمیشە خەریکی فتواو کاروباری ئایینیو چارەسەر کردنی کێشەی موسوڵمانان بووە توانیویەتی نزیکەی ٧٥ دانراوی بەنرخو نایاب بنووسێت کە بوونەتە ٧٥ ئەستێرەی پرشنگدار لەئاسمانی ئاینو ئەدەبدا. بە سیٚ زمانی کوردیو عەرەبیو فارسی(١).

| ز | ناوی دانراو | زمان | باری چاپ | ژ.لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | تەفسیری نامی (لە ٧ بەرگدا) | کوردی | چاپ کراوە | نزیکەی (٣٥٠٠) |
| ٢ | شەرحی دیوانی نالی | کوردی | چاپ کراوە | ٧٤٨ |
| ٣ | شەرحی دیوانی مەولەوی | کوردی | چاپ کراوە | ٥٤٣ |
| ٤ | شەرحی دیوانی مەحوی | کوردی | چاپ کراوە | ٥٩٧ |
| ٥ | شەرحی دیوانی بێسارانی | کوردی | چاپ نەکراوە | – |
| ٦ | شەرحی دیوانی سالم | کوردی | چاپ نەکراوە | – |
| ٧ | دیوانی فەقیٚ قادری هەمەوەند | کوردی | چاپ کراوە | ٧٩٠ |
| ٨ | وتاری ئایینی بۆ رۆژانی هەینی | کوردی | چاپ کراوە | ٢٤٠ |
| ٩ | چل چرای ئیسلام | کوردی | چاپ کراوە | |
| ١٠ | ئاوی حەیات | کوردی | چاپ کراوە | |




| ژ | ناوی کتێب | زمان | بارودۆخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | نورو نەجات | کوردی | چاپ کراوە | |
| ١٢ | ئیقباڵ نامە | کوردی | چاپ کراوە | |
| ١٣ | ئیمان و ئیسلام | کوردی | چاپ کراوە | |
| ١٤ | ئەساسی سەعادەت (ئەم شەش دانەی سەرەوە بە کۆمەڵ بەناوی "سەرچاوەی ئایین" چاپ کراون) | کوردی | چاپ کراوە | ٣١٤ |
| ١٥ | حەج نامە<br>(ئەم کتێبە بەخەتی خودی مامۆستا بڵاوکراوەتەوە). | کوردی | چاپ کراوە | ٢١٦ |
| ١٦ | یادی مەردان (٢ بەرگ) | کوردی | چاپ کراوە | ١٣٢١ |
| ١٧ | شەرحی تەصریفی زەنجانی | کوردی | چاپ کراوە | ٢٣٩ |
| ١٨ | بارانی ڕەحمەت | کوردی | چاپ کراوە | ١٨٢ |
| ١٩ | نوری قورئان | کوردی | چاپ کراوە | ٢٣٢ |
| ٢٠ | ئەناو سکاڵا | کوردی | چاپ کراوە | ٢١٦ |
| ٢١ | بەهارو گوڵزار | کوردی | چاپ کراوە | ٢٦٧ |
| ٢٢ | شەرحی عەقیدەی مەرضیە | کوردی | چاپ کراوە | ٨٦٨ |
| ٢٣ | مەولود نامە | کوردی | چاپ کراوە | ٣٩ |
| ٢٤ | میعراج نامە (ئەم دوانە لەیەك بەرگدا چاپ کراون) | کوردی | چاپ کراوە | ٤٣ |
| ٢٥ | شەریعەتی ئیسلام (٤ بەرگ) | کوردی | چاپ کراوە | ١٥٠٥ |
| ٢٦ | بنەماڵەی زانیاران | کوردی | چاپ کراوە | ٦٣٢ |
| ٢٧ | ڕێگای بەهەشت | کوردی | چاپ کراوە | ٧٨ |
| ٢٨ | بەدیعی نامی | کوردی | چاپ کراوە | |
| ٢٩ | عەروزی نامی (ئەم دوانە لەیەك بەرگدا چاپ کراون) | کوردی | چاپ کراوە | ١٤٣ |
| ٣٠ | مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ (٤ بەرگ) | کوردی | چاپ کراوە | ١١٨٣ |
| ٣١ | نوری ئیسلام | کوردی | چاپ کراوە | ١٦٧ |
| ٣٢ | ڕێگەی ڕەهبەر | کوردی | چاپ کراوە | ٢٤٤ |
| ٣٣ | دوڕشتە (فەرهەنگ) | عربـــی- کوردی | چاپ کراوە | ١١٢ |
| ٣٤ | نامەی هوشیار | کوردی | چاپ کراوە | ٢٠٧ |
| ٣٥ | خولاصەی تەفسیری نامی (٣ بەرگ) | کوردی | چاپ کراوە | ؟ |
| ٣٦ | المفتاح | عربی | چاپ کراوە | |
| ٣٧ | الورقات | عربی | چاپ کراوە | |
| ٣٨ | المقالات في المقولات | عربی | چاپ کراوە | |
| ٣٩ | العزیزة | عربی | چاپ کراوە | |
| ٤٠ | الوجیهة<br>(ئەم پێنج دانە لەیەك بەرگدا بەناوی رسائل الرحمة في المنطق والحكمة)دا چاپ کراوە | عربی | چاپ کراوە | ٢٨٣ |





| ٤١ | القصيدة الوردية | عربي | چاپ كراوه | ٣٩ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٢ | جواهر الكلام | عربي | چاپ كراوه | ٢٦٩ |
| ٤٣ | خلاصة جواهر الكلام | عربي | چاپ كراوه | ٣٩ |
| ٤٤ | نور الاسلام | عربي | چاپ كراوه | ٣٠٨ |
| ٤٥ | نور الايمان | عربي | چاپ كراوه | ١١٨ |
| ٤٦ | الصرف الواضح | عربي | چاپ كراوه | |
| ٤٧ | مفتاح الادب | عربي | چاپ كراوه | |
| ٤٨ | الخلاصة في الوضع والبيان | عربي | چاپ كراوه | |
| ٤٩ | التبيان في الوضع والبيان (ئەم چوار دانە لەيەك بەرگدا بەناوى رسائل العرفان) چاپ كراوه | عربي | چاپ كراوه | ٢١٩ |
| ٥٠ | ارشاد الأنام | عربي | چاپ كراوه | ٢٥٨ |
| ٥١ | ارشاد الناسك الى المناسك (بەخەتى مامۆستا خۆى بلاوبووەتەوه) | عربي | چاپ كراوه | ١٤٣ |
| ٥٢ | علماؤنا في خدمة العلم والدين | عربي | چاپ كراوه | ٦٦٨ |
| ٥٣ | مواهب الرحمن في تفسير القرآن (٧ بەرگ) | عربي | چاپ كراوه | ٣٢٨٤ |
| ٥٤ | جواهر الفتاوى (٣ بەرگ) | عربي | چاپ كراوه | ١١٠٤ |
| ٥٥ | الوسيلة في شرح الفضيلة | عربي | چاپ كراوه | ٨٣٠ |
| ٥٦ | المواهب الحميدة (٢ بەرگ) | عربي | چاپ كراوه | ١٠٧٠ |
| ٥٧ | صفوة اللآلي من مستصفى الامام الغزالي | عربي | چاپ كراوه | ٥٢٢ |
| ٥٨ | الانوار القدسية | عربي | چاپ كراوه | ١٤٣ |
| ٥٩ | الوردة العنبرية | عربي | چاپ كراوه | ٣١١ |
| ٦٠ | اسناد الاعلام | عربي | چاپ كراوه | ٢٠٠ |
| ٦١ | اعلام بالغيب والهام بلا ريب | عربي | چاپ كراوه | ٧٢ |
| ٦٢ | الرسالة وانوارها | عربي | چاپ كراوه | ٢٤ |
| ٦٣ | كشف الغامض | عربي | چاپ كراوه | ١٧ |
| ٦٤ | اللمعة في الجمعة (ئەم دوانە لەناو كتێبى "جواهر الفتاوى) دا چاپ كراوه | عربي | چاپ كراوه | ١٦ |
| ٦٥ | فوائد الفوائح | فارسي | چاپ كراوه | ٤٠٦ |
| ٦٦ | رسالة شمشير كارى | فارسي | چاپ كراوه | نەمديوه |
| ٦٧ | شەمامەى بێندار | كوردي | چاپ نەكراوه | - |
| ٦٨ | پەيڕەوان | كوردي | چاپ نەكراوه | - |
| ٦٩ | بنەماڵەكانى كوردستان | كوردي | چاپ نەكراوه | - |
| ٧٠ | گەشتى ژيانم | كوردي | چاپ نەكراوه | - |
| ٧١ | المناجات عند قاضي الحاجات | عربي | چاپ نەكراوه | - |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٢ | باوەشێنی دڵ | كوردی | چاپ نەكراوە* | – |
| ٧٣ | شرح الصمدية | عربی | چاپ نەكراوە | – |
| ٧٤ | شەرحی (قەسیدەی نور)ی خاكی | كوردی | ؟؟؟ | ؟؟؟ |
| | مامۆستا چەند حاشیەیەكی مدونەیشی هەیە كە بریتین لە | | | |
| ١- | حاشیەی مدونە بەسەر المفتاح | | | |
| ٢- | حاشیەی مدونە بەسەر الورقات | | | |
| ٣- | حاشیەی مدونە بەسەر المقالات | | | |
| ٤- | حاشیەی مدونە بەسەر العزیزة | | | |
| ٥- | حاشیەی مدونە بەسەر الوجیهة | | | |

كە ئەم پێنج حاشیە لەناو كتێبی (رسائل الرحمة في المنطق والحكمة)دا چاپ كراون جگە لەوە كە بەپێی دابو نەریتی مەلا زاناكانی كوردستان دەبێ مامۆستا دەیانو سەدان حاشیەی بەسەر كتێبە ئایینییەكانی حوجرەدا هەبێ. چەند وردە حاشیەیەكیش كە بەرچاوم كەوتوون بریتین لە:

(حاشیە بەسەر شرح العقائد وتهذیب الكلام والوسیلة ورسائل العرفان وجواهر الفتاوی ....).

بەقەد دانە دانەی ئەو پیتانەی كە مامۆستا نووسیونی، بەپێی ژمارەی ابجدیو هەزاران ئەوەندە سلاوو رەحمەت بۆ رۆحی زیندوو بەرزەفڕی مامۆستا نامی.

وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

تێبینی: ئەو كتێبانەی كە بەكۆمەڵ لەچاپ دراون تەنها لەڕیزی دوایەمین كتێبدا ژمارەی لاپەڕەی هەموویانم نووسیوە بۆ نموونە سەرچاوەی ئایینی كۆمەڵێكی شەش كتێبیە (٣١٤) لاپەڕەیە ژمارەی لاپەڕەكانم لەبەرابەر شەشەم كتێب كە (ئەساسی سەعادەت)ە نووسیوە.

## سەرچاوەكان:

١- علماؤنا في خدمة العلم والدین- دانراوی مامۆستا ملا عبدالكریم مدرس بغداد (١٩٨٣).

٢- كاروانی خەیاڵ، دیوانی هێدی شاعیر (چاپی دووەم- هەولێر- ١٩٩٧).

٣- هەواری خاڵی، سەرجەمی نووسینی هێمنی شاعیر (چاپی ئاراس- ٢٠٠٠).

٤- سەرجەمی بەرهەمی- حسن قزلجی- چاپی سەردەم (٢٠٠٣).

٥- هەژارانە: كە تایبەت بوو بە مەرگی مامۆستا هەژارەوە لەئێران لەساڵی (١٣٧٠)ی هەتاوی دەرچووە.

(١) تائێستا بەشێوەیەكی گشتی ناوی كتێبەكانی مامۆستا لەهیچ شوێنێك بڵاو نەبووەتەوە تەنها لەیەك دوو كتێبی خۆیدا ناوی هەندێك كتێب نووسراوە كە ناگاتە نیوەی كتێبەكانی بۆ نموونە كتێبی (باوەشێنی دڵ) لە هیچ جێیەك ناوی نییە دەسنووسی كتێبەكەم بەشێوەی ئیستینساخ لای برای بەڕێزم كاك ئاوات نەقشبەندی دیوە. خوا دەزانێ كە چەند دەستنووسی تری هەبێت كە ئێمە نەماندیوەو ناویمان نەبیستووە.







# كەڵە زانای شاری بابەگوڕگوڕ لوتفی شاعیر

عمر شێخ لطیف بەرزنجی

شاری کەرکووك یەکێکە لە شارە سەرەکیی و هەرە گرنگەکانی کوردستان بگرە لە هەندێ ڕوو و تەوەرەوە لە پێشەوەی شارەکانی ترەو کاریگەری زیاتر بووە. وێڕای ئەو هەموو گوشارەی کە دەسەلاتە یەك لەدوایی یەکەکان لەسەر خەڵکی ئەم شارەیان داسەپاند، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ نەوەی زیاتر ئازاو جەربەزەو چاو نەترس و خەباتگێڕیان تیا هەڵدەکەوت. دوژمن بەهەموو توانای خۆی تەقەلای سڕینەوەی ئاسەواری کوردی لەم شارە دەدا، چین و توێژ لە کەرکووك نەما قوربانی نەدا، ئەو ڕژێمە لەو باوەڕەدا بوو بەو هەنگاوانەی کورد قات و قڕ دەکات.

لەگەڵ ئەو هەموو دڕندەکارییە کە دوژمن دەرحەق بەگەلی کوردی ئەم شارەی کرد، هەست و سۆزی کوردایەتی و خەبات کردن لەپێناوی بەئامانج گەیشتن لە گەشەکردن دابوو. لەهەر بوارێك بەسەدان کەڵە پیاوی خەباتگێڕی تیا هەڵکەوت، لەسەدان بواری ژیان پلەی سەروەرییان بەدەست هێنا، لەسەرووی هەموویانەوە خەباتی چەکداری نەتەوایەتی، پاش ئەم هەموو خۆڕاگرتنە، سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئەم ڕۆژەمان بەچاوی خۆمان دی و ئاواتی شەهیدەکانمان هاتە دی. کەوابوو کاتی ئەوە هاتووە یادی خەباتی ئەو کەڵە پیاوانە بکەینەوە، کاتی ئەوە هاتووە، شانازی بەخەبات و لێهاتووییان بکەین، (شێخ لطیف ڕەحیماوەش) یەکێ بوو لەوانەی کە بەدەم و دەست هانی نەتەوەکەی بۆ خەبات و تێکۆشان دەدا. ناوی تەواوی ئەم زاتە (مەلا شێخ لطیف کوڕی شێخ ڕەضا شێتە کوڕی شێخ معروف کوڕی شێخ فتاح قولەکۆڕی شێخ حسن قولەکۆڕی شێخ محی الدین کەرکووك کوڕی شێخ حسن گڵەزەردە) بوو بە (١٨) پشت دەگەیشتەوە سەر (شێخ عیسی و شێخ موسی)ی بەرزنجەو بە (٢٩) پشتیش دەگەیشتەوە سەر (ئیمام حسین کوڕی ئیمام علي) لە نەوەی حەزرەتی (فاطمة)یە ڕەزای خوایان لێ بێت.

لەساڵی (١٩٠٥)ی زایینی، لەگوندی (پەڵکانە)ی سەر بەناحیەی (قرە حسن) لەخۆرهەلاتی شاری کەرکووك چاوی بەدونیا هەڵهێنا.





لەگـەڵ تـەواوبوونی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی، بـۆ خوێنــدن شـێخ لطیـف ڕەوانـەی لای مـەلا کـرا. لەسەرەتاوە لای خوا لێخۆشبوو (مەلا سعید میلبان) لەگوندی (قوین پەلك) دەستی دایە خوێندن. بەڵێ ئەم زاتەش بەو ڕێچکەیەدا ڕۆیشت کە تەواوی فەقێی ئەو سەردەمە دەیگرتـە بەر، پاش تـەواوکردنی قورئـانی پیرۆزو چەند کتێبێکی بچووك لەخزمەت ئەم مامۆستایە، بۆ قۆناغی دووەم مزگـەوتی (نائب)ی هەڵبـژاردو خـۆی گەیانـدە کـۆڕی فەقێیـەکانی خـوا لێخۆشـبوو مامۆسـتا مـەلا (شـێخ سـتار شـێخ محمـد کـەرەدان) مـاوەیێکی زۆر لەخزمـەت ئـەم زانایـە دەرسـی خوێنـد، پاشـان لەسـەر داواکـاریو بڕیـاری خـوا لێخۆشـبوو (شـێخ عبـدالکریم شـێخ مصـطفى)ی دارە خورمـای خـاڵی، ئـەو و خـوا لێخۆشـبوو (شـێخ کاکـە شـێخ عبدالکریم) ڕەوانەی دیبەگە کران و بوون بەفەقێی خوا لێخۆشبوو مامۆستا مـەلا اسماعیـل لـە مزگـەوتی گەورەی دیبەگە.

پـاش ماوەیێــك دوو بـەدوو چـوونە خزمـەت خـوا لێخۆشـبوو مامۆسـتا مـەلا (طـاهر عـاڵلأیی) لـە شــارۆچکەی مەخمــور، ماوەیـەکی چـاکیش لای ئـەم زانایـە بـۆ خوێنـدن مانـەوە، لەپاشـان (مـەلا شـێخ لطیــف) گــەڕایەوە دەڤــەری شــاری کـەرکووك و خـۆی کـردە یـەکێ لـە فەقێیـەکانی خـوا لێخۆشـبوو مامۆسـتا مـەلا (عــــلاءالدین) لـە شـارۆچکەی (لەیــلان) لەکەرکووك دوایـی مامۆسـتا مـەلا (علاءالـدین) بـــەرەو لای خوالێخۆشـــبوو مامۆســـتا مـــەلا (شـــریف سیامەنسـوری) بەڕێکـەوت لەگونـدی (خـاڵو بازیانی).

سەرەتای خوێندنی قۆناغی (مستعد)ی بردە خزمەت خوا لێخۆشبوو مامۆستا (مـەلا محمـد هـەورامی) لەمزگەوتی ئیمام قاسم لەشاری کەرکووك.

پاش ماوەیێك مانەوە لای ئەم زاتە، خۆی گەیانـدە خزمـەت مامۆسـتا (مـەلا سـلیمان تـورك) لەمزگـەوتی سەید احمدی خانەقا هەر لەناو شاری کەرکووك. پاش ئەوەی مامۆستا (مەلا سلیمان تورك) وەفـاتی کـرد، (مەلا شێخ لطیف) هانای بردە بەر مامۆستا (مەلا علی ئەفەندی مودەریس)، هەر لای ئەم زاتە، کتێبـەکانی (فەناریو سەعدوللاو ئیعانە)ی تەواو کرد. لەماوە کۆتاییەکان بوو، بـاوکی بەسـەریا کـۆچی دوایـی کـردو ئەرکی ماڵی باوکی بەسەریا شکاو بارودۆخی ژیانی هەندێ بەرەو ئاڵۆزی ڕۆیشت. بـۆ دابـین کردنـی بـژێو بۆ ئەو خێزانە، ناچار بوو دەستبەرداری خوێندن ببیێو دەست بەمەلایەتی بکا. سەرەتای ژیـانی مەلایـەتی لەناوچەی (ساڵەییو شوان)ەوە دەستی پێ کرد چەندین گوندی ئەو ناوچەیەی کرد لەوانە:

((کەلۆڕی گەورە (حسن ئەفەندی)، کەلۆڕی بنـار، بیبـانی گـەورە، بیبـانی بجـوك، یارمجـە، بیر ئەسـپان، بیرئالیك)) لەگەڵ گوندی دوو سەرەی قەراج.

پیاوێکی شارەزاو مەلاییکی بەتوانا بوو، سینە فراوان بوو.

خەڵکی زۆر حەز لە وتە خۆشەکانی دەکردو بەردەوام بۆ پاساوی وتـەکانی، ئایـەتو حـەدیسو پـەندی پێشینانی بە بەڵگەوە دەهێنایەوە.

ئەم زاتەش وەکو زۆربەی ئەدەب دۆستو نووسەرو شـاعیر، لـە حـوجرەی مەلایەتیـەوە دەسـتی پێکـرد، بۆ شیعرەکانی نازناوی (لوتفی) هەڵبژاردو لەژێر ئەو نازناوە هۆنراوەکانی ریزبەند کرد.





دیوانێکی شیعری ئەم زاتە لەساڵی (١٩٨٤) بەهەوڵ و تەقەلاّی خوالێخۆشبوو شێخ لطیف شێخ صادق بەرزنجی (شێخ لطیف قەتەوی)و یارمەتیو سەرپەرشتی شێخ عبداللەی شێخ بابا علی خوشکەزایو شێخ عبیدی کوڕی هاتە چاپ کردن.

وەکو هەموو دەزانین، زۆربەی مەلاکان ژیانێکی سادەو مام ناوەندیان بەسەبردووە، (لوتفی)یش هەروەکو ئەوان لەم دوو کۆپلە هۆنراوەیە، گوزارشت لەو بارودۆخەی ژیانی دەخاتو دەڵێ:

لەبــەر دەســت کــورتی هــەم ئــاخر شــەڕی
ســـەگی کائینـــات گشـــت بـــەمن وەڕی

هـەروەها، مـەلا شـێخ لطیـف، بـەم چـەند کۆپلـە هۆنراوەیـە بـاس لـەگوزەرانی دووا ڕۆژەکـانی ژیـانی دەکاتو دەڵێ:

دڵـــە بـــە جووتـــە دوو مێوانـــت بـــوو
دوو خـــەمی گـــەورە لەســـەر شـــانت بـــوو

یـــــەکێ هـــــەژاری دەردی گرانـــــــە
دووەم پیرییـــــە، دەســـــت لێکبەردانـــــە

نـــە بەشـــەو خـــەوتن، نـــە بـــەڕۆژ گـــەڕان
دایـــــم ڕەق و رووت وەك دار حـــــەیزەران

ئـەم زاتـە، سـەرەڕای نـەبوونیو دەســـت کورتـــیو خێـــزان زۆری لایـەنی خواناسـینی فـەرامۆش نەکردو هەردەم هانای بۆ خوا دەبردو دەپاڕایەوە، بۆ بەڵگەش ئەم چەند کۆپلـە هۆنراوەیـە گوزارشـت لـەوە دەکات:

ئـەی خودایـە روو لـەکوێ کـەم غـەیری تـۆ قـەت کـەس نییـە
شـــیوەن و گریـــان و ئـــاهم بـــۆ گونـــاهم بـــەس نییـــە
گـــەر ئەبیســـتن ئـــەی رەفیقـــان ناڵـــەیێ پێشـــی ســـەحەر
دەنگـــی هـــاواری منـــە دێ، نـــاقووس و جـــەرەس نییـــە

بەهەمان شێوە پەنا دەباتە بەر پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت، بۆ حاڵی خۆی دەلاوێتەوەو دەڵێ:

یارەســـول الله دەخیلـــە مـــاڵی وێـــران بـــێ مـــنم
چاو بەئەشك و دڵ بەئاهو غـەرقی عوسیان بـێ مـنم





روو رەشـی دونیـاو قەیامـەت توێشـەیٚ راهـم نییـە

نائومێدی کردەوەی خـۆم رەنـج بەخوسـران بـێ مـنم

ئەم زاتەش وەکو زۆربەی شاعیرانی کوردستان، لەدەیان غەزەل لە وەسفی خاك و نیشتمان دەدویٚو خۆشەویستی خۆی لەئاستی دەردەبڕیٚو دەڵێ:

کوردسـتانەکەم نیشـتمانی مـن

بینـای چـاوانم دڵ و گیـانی مـن

سـەیری دیمـەنی رەنگـاو رەنگـی تـۆ

هـۆی نەشـاتمەو هـەم ژیـانی مـن

مەلا شێخ لطیف، بەدرێژایی تەمەنی دوو جار بۆتە کارمەندی میری، جارێك لەسالآنی سییەکاندا، لە سەردەمی قیرتـاوکردنی رێگـای (حـەریر- رەوانـدوز) جارێـك بـوو بەچـاودێری کرێکـاران لەشـارەوانی کـەرکووك لەسـەردەمی خـوا لێخۆشـبوو شـەهید شـێخ معـروف بـەرزنجی، لـەجاری یەکـەم، لـەو کاتـەی چاودێری کرێکاران بوو لە قیرتاوکردنی رێگای ناوبراو، وا دەبێ بەڕێوەبەرێکی کوردیان بۆ رەوانە دەکەن، هەرکە دەگاتە شاعیر، لوتفی سۆزی بەرز دەبێتەوە کاسەی هەڵبەست نووسینی دێتە رژاندن و ئەم چەند کۆپلە هۆنراوەیە دەنووسێ:

وەکـو بیسـتوومە ئەمڕۆکـە ئـەڵێن کـوردێ مودیرمانـە

سـەد شـوکر الحمـد لله کـە نەوبـەت وا سـەریرمانە

هەزار حەمدو سەنا یارەب کە مـن دیـتم بەچاوی خـۆم

منـداڵی کـوردە ئەمڕۆکـە لـە سـەد جێگـا ئەمیرمانـە

زەمانێکـە هـەزاری کـورد لـەژێر بـاری رەزالەتـدان

فرێـدەن ئێـوە بـەرگی جـاو ئـیتر نۆبـەی حەریرمانـە

شـاعیر کـاتێ دەگاتـە سـاڵانی کۆتـایی تەمـەنیو مـووی سـپی لـە سـەرو سیمای بەدەردەکـەوێ دێتـە ئاخافتنو پاساو هێنانەوە بۆ هەندێ لەکردەوە نامۆیەکانی تافی لاوی دەڵێ:

رەنگـی زەردو ئەشـکی چـاوم دەردەکـەم زۆر کارییـە

هـەروەکو سـیروان لەچـاوم سـەیلی ئەشـکم جارییـە

گەر ئەڵێی تۆزێ ئەژیم هەر وەك سـەفیهی بێ خەبـەر

دەردی عیشـقە وای لێکـردووم مانـەوەم بـێ عارییـە

عارو عەیبم لێ مەبینە گەر لەناکەس روو دەکەم
بارەکەم یەکجار گرانە عیللەتی ناچارییە
زانین و عەقل و کتابەت سوودێکی بۆ من نەبوو
رەنجەکەم گشت چوو بەبادا بەختەکەم هەر خوارییە
بێ سەمەر بوو داری بەختم تووڵی عومرم رابوارد
رۆژ بەدایم دەردو زیللەت هەم شەوم بێدارییە
باخەوانی باخی گوڵ بووم سەردەمێ خۆش رامبوارد
ماوەیێکی کورت و کەم بوو داخەکەم یەکجارییە
لوتفی خۆشی چاك دەزانێ ئاخیرەت هەر رووت ئەبێ
بۆیە هەر رووت و رەزیلی کوچەوو ناو شارییە.

**لە سەردەمی رێکەوتننامەکەی (١١) ئاداری ١٩٧٠، شادیو کامەرانی ئەم زاتەشی وەکو هەزاران کورد گرتەوە، هەموو دڵخۆش بوون، شاعیر دەیان هۆنراوەی بەم بۆنەیەوە دانا، ئەمەش چەند کۆپلەیێکە لەو هۆنراوانە**

کوردستان مژدە بەیانی داوە
خۆر لەسەر شاخت گوێچکەی کێشاوە
سەیری دونیاکە لە خوارو لە ژوور
هەمووی بەیەکجار لەخەو هەستاوە

**لەرووی بۆچوونی شاعیر، لەمەڕ کێشەی ئافرەتی کورد، شاعیر بەم چەند کۆپلە هۆنراوەیە گوزارشت لەئافرەت دەکات و هانیان دەدا بۆ لەبەرکردنی پۆشاکی کوردەوارییو دەڵێ:**

لەبەرکە خانمی کورد بەرگی کوردی
بەلەنجەو لارو نازو سەر بڵندی
چ چالاك و دلێرو خانو مانی
بەناوبانگی لەعالەمدا بەمەردی

**ئەم زاتە سەرەڕای بواری شیعر نووسین، چەندین بەرهەمی جۆراو جۆری هەبوو لەوانە:**

**١- وەرگێڕانی کتێبی (السادات البرزنجیة) لە عەرەبییەوە بۆ کوردی کە لەدانانی خوا لێخۆشبوو شێخ عبدالقادر محمد بووە، لەساڵی ١٩٥٦ لەکەرکوك چاپ کرابوو.**

**٢- وەرگێڕانی کتێبی (فتح المبین، راس الغول) لە عەرەبییەوە بۆ کوردییو نزیکەی (٤٠٠) لاپەڕەی دەستنووسە.**




٣- وەرگێڕان و هۆنراوەی مەولودنامەی پێغەمبەر (د.خ).

٤- وەرگێڕانی کتێبی (فتح ملك...) ئەویش هەر لەزمانی عەرەبییەوە.

٥- وەرگێڕانی چەند بەشێك لە کتێبی (قصص الأنبياء) بۆ کوردی.

٦- لەچاپدانی دیوانێکی شیعرو هۆنراوە، لەژێر ناونیشانی (دیوانی لوتفی) لەساڵی ١٩٨٤.

سەرەڕای ئەمانە هەموو، لوتفی بەسەدان غەزەلی دەربارەی خەباتی گەلی کوردو شۆڕشی ئەیلول دانا، (بەرهەمە دەستنووسەکانی مەلا شێخ لطیف رحیم ئاوە) ئەم زاتە سەرەڕای بواری هۆنراوەو شیعر نووسین. چەندین بەرهەمی تری دەستنووسی لەپاش بەجێ ما، لەوانە:

١- وەرگێڕانی کتێبی (السادات البرزنجية) لەعەرەبییەوە بۆ کوردی کە لەدانانی خوا لێخۆشبوو شێخ عبدالقادر محمد بەرزنجی لەچاپدراوی ساڵی ١٩٥٦.

٢- وەرگێڕانی کتێبی (فتح المبين، راس الغول) لەعەرەبییەوە بۆ کوردیو نزیکەی (٤٠٠) لاپەڕەیە.

٣- وەرگێڕان و هۆنراوەی مەولودنامەی پێغەمبەر (د.خ).

٤- وەرگێڕانی چەند بەشێك لەکتێبی (قصص الأنبياء).

سەرەڕای ئەمانە هەموو، بارودۆخی شاری کەرکووك بوو بەهۆی سووتاندن و لەناوبردنی سەدان غەزەلی کوردایەتی کە شاعیر بەسەر شۆڕشی ئەیلول نووسیبووی، زۆر بەداخەوە کە هەموو بوون بەخۆراکی ئاگرو ئاسەواریان نەما.

ئەم زاتە لەژیانیدا (٣) ژنی هێنابوو، لەو (٣) ئافرەتە (٨) کوڕو (١٠) کچی لەپاش بەجێ ما، زۆربەیان لەشاری کەرکووك و هەولێر نیشتەجێن.

لوتفی شاعیر لە نیوەڕۆی رۆژی سێ شەممە، رێکەوتی ١٩٨٩/٥/٢٣ لە نەخۆشخانەی (مدينة الطب) لە شاری کەرکووك پاش ململانێکی زۆر لەگەڵ نەخۆشی، گیانی سپاردو دڵە گەورەکەی لەلێدان وەستا و بۆ هەتا هەتایە ماڵئاوایی لە سەرجەم نەوەو کەس و کارو دۆستانی کرد. بەئامادەبوون و بەشداری جەماوەرێکی زۆر لەخزم و کەس و کارو خەڵکی شاری کەرکووك بەگشتیو گەڕەکی رەحیماوە بەتایبەت، تەرمی ئەم زاتە بەرێوڕەسمێکی شیاو لەگۆڕستانی گەڕەکی رەحیماوە بەخاك سپاردرا. بەتەواوبوونی چلەی ئەم زاتە، لەهۆڵی میدیا لەشاری هەولێر ئاهەنگێکی ماتەمینی بۆ سازدراو، دەیان شاعیرو رووناکبیرو کەس و کاری ئامادەبوون، هەر لەو ئاهەنگە دەیان پارچە هۆنراوەی لاوانەوە (مرثية)یان بەسەریا خوێندەوە.

بۆ رێزلێنان لە شاعیر، تەواوی ئامادەبووانی ئەم چلەیە، ماتەمینی دایگرتبوون و غەمباری لە سەرو سیمایاندا دیاربوو.

هەزار سڵاو لەگیانی پاکی لوتفی شاعیرو گشت شاعیرانی ئەم شارە خەباتگێڕە.

**سەرچاوەکان:**


١- تاوتوێی کردنی دیوانی لوتفیو ژیاننامەکەی.

٢- شارەزاییو زانیاری تایبەتی خۆم وەکو کوڕە زایێکی ئەم زاتە.




# الدعاء - نزاو پاڕانەوە

مەحمود مەلا سەید ئەحمەد فەیلەسوف

ماخاب عبد بصدق دعاك
وأنت كريم مجيب الدعاء

پاڕانەوەو نزاکردن هۆکارێکە لەهۆکارەکانی نزیک بوونەوە لەخودای گەورە، وەخوای گەورە بەعیبادەت داینـاوە چونکە پاڕانەوە (موخی) خواناسییە، هەردەم خوای گەورە پێی خۆشە بەندەکانی لێی بپاڕێنەوەو نزا بکەن بۆ ئەو مەبەستەی کە هەیانەو دەیانەوێت داوای بکەن خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ غافر/٦٠. دەبێ بزانیت کە خوای گەورە ئاگای لەتۆیەو ئاراستەی داواکردن و پاڕانەوەت لەخوای گەورە بکەیت نابێ هیچ کەسێکی تر بکەی بەشەریکی وەیان پاڕانەوەکەت بۆ کەسێکی تر بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ غافر/١٤. لێرەدا یەکێك لە شەرتەکانی گیرابوونی نزا (الاخلاص)ە. مەرجەکان (الشروط) پاڕانەوە دوورو نزیکی بۆ نییە لەهەر شوێنێك بووی دەست بەرز بکەرەوەو داواو نزات بۆ خوای گەورە دەست پێ بکە، چونکە خوای گەورە نزیکی تۆیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ البقرة/١٨٦. یەکێکی تر لە شەرتەکانی قبول بوونی دوعا ئەویش خوا ناسییەو نزیك بوونەوە لەخوای گەورەیە چونکە خوای گەورە هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە بەندایەتی نانوێنن و لووت بەرزی دەنوێنن. کە دەست بەرزکەنەوەو بپاڕێنەوە لەخوای گەورە، خوای گەورە سزای ئەو کەسانە دەدات و دەیان خاتە ناو ئاگری دۆزەخ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ غافر/٦٠ دەبێ باوەڕت هەبێ کە خوای گەورە تاك و تەنیایەو شەریکی نیە، دەبێ پاڕانەوەکەت تەنها لەخودی ئەو بێ، وەدەبێ بزانی گیرابوونی نزاش هەر لای خوای گەورەیەو هەر ئەوە لێت خۆش دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ المائدة/٢٧، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُولَٰئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ فاطر/١٠.

وتەی باش، کردەوەی باش بەرز دەبێتەوە بۆ لای خوای گەورە، چونکە وتەی باش چاکەکارییە واتە (صەدەقەیە)، گیانی بەندایەتی نیشان بدە لەکاتی پاڕانەوە، وە خۆت بەبەندەیەکی گوناهبار بزانی وە لەخوای گەورە زۆر بترسی، وە زۆر بپاڕێیتەوە (واتە الحاح) کردن لە نزاکردن و پاڕانەوە دروستە و خوای گەورە پێی خۆشە بەندەکانی زۆر بپاڕێنەوەو دەست بەرز بکەنەوە بۆ خۆت یان بۆ کەس و کارت بەتایبەتی بۆ دایك و باوکت وەیان بۆ مردووانی نزیکت دوای ئەوەی بۆ هەموو موسڵمانان بەتایبەتی ئومەتی پێغەمبەر (د.خ).





پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: (**مـن لم يسئل الله يغضب عليه**) (رواه ابن ماجه في سنه من حديث ابى هريرة).

هەروەها پێغەمبەرمان دەفەرموویت: (**لاتعجزوا في الدعاء فإنه لايهلك مع الدعاء أحد**) **رواه الحاكم في صحيحه من حديث انس عن النبي صلى الله عليه وسلم**).

هەر بەندەیەك لەخوای گەورە نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی تووڕە دەبێ وەكەسیش لەكاتی دوعاكردن ڕوحی دەرناچێ. لێرە پێغەمبەرمان داوامان لێ دەكات بپاڕێینەوە لەخوای گەورەو بەردەوام بین لە نزاكردن.

بكەن لەكاتی پاڕانەوە چەند زۆر بپاڕێیتەوەو داواو نزات زۆر بێت خوای گەورە پێی خۆشە.

## چۆنێتی پاڕانەوە لەخوای گەورە

بەندەكانی خوا دەبێ لەكاتی پاڕانەوەو نزاكردن و وەستان بەرامبەر بەخوای گەورە ملكەچی و بەندایەتی خۆی بنوێنێت و بەشێوەیەكی جوان دەست بەرز بكاتەوە لەسەرەتادا واچاكە دوو ركعات نوێژ بۆ خودای گەورە بكەیت، ئینجا پەیمانێك لەنێوان خۆت و خوای پەروەردگار تازە بكەیتەوەو (استغفار) كردن لەهەموو گوناهەكانت گەورە بێت یان بچووك، گوناهی ئاشكرا یان نهێنی، هەستت پێ كردبێ كە ئەو شتە گوناهە یان نەتزانیبێ كە گوناهە، دەبێ بزانیت كە خوای گەورە بەسۆزو بەزەییە، واچاكە بەناوی خوای گەورە (اسماء الله الحسنى) یان بەسیفەتە جوانەكانی خوای گەورە دەست بەپاڕانەوەو دوعاكەت بكەی بەوەستان یان بەدانیشتن وەیان بەپاڵەوە. بۆ ئەو كەسانەی نەخۆش و پەككەوتەن دەتوانن بپاڕێنەوە بۆ خۆت و بۆ كەس و كار و بۆ ئومەتی پێغەمبەر (د.خ) و هەموو موسڵمانان كە خوای گەورە هیدایەتی خۆت و كەس و كارو ئومەتی پێغەمبەر (د.خ) بدات و لە گوناهەكانیان

**یەكێ لە مەرجەكانی قبوڵ بوونی دوعا (خوناسین) بوو، واتە نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، بەڵام ئەگەر بێ ئاگا بووی لە خوای گەورە ئەوە پلەی نزیك بوونت لە خوای گەورە كەم دەكاتەوەو تۆ دوور دەخات لە رەزامەندی خوا ئەو نزایەش قبوڵ نابێ یا دوا دەكەوێت**

پێغەمبەرمان دەفەرموێت: (وذكر الأوزاعي عن الزهري عن عروة عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(**إن الله تعالى يحب الملحين في الدعاء**) خوای گەورە پێی خۆشە ئیلحاح كردن لەكاتی پاڕانەوە چونكە پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموویت: زۆر ئیلحاح تۆبەیەكی راست بكەیت. واچاكە كاتی پاڕانەوەو نزا كردنت لەو كاتانە بێت كە نزا گیرا دەبێت، وە لەكاتی دوعاو پاڕانەوە واچاكە رووت لەقیبلە بێت و دەست بەرز بكەیتەوە، سەرەتا حەمدو سەنای خوای گەورە دەكەیت و سەلام لەدیداری پێغەمبەر (د.خ) دەكەیت ئینجا خۆش بێت. وە لەو كاتەدا چی داوا بكەیت دەتوانیت، بەمەرجێك هیچ داواكارییەكی تێدا نەبێ كە خوای گەورە پێی ناخۆش بێت، وە داوای شیفا بۆ هەموو نەخۆشێك بكە كە خەسڵەتێكی بڕوادارانەیە.

لە كۆتاییدا جارێكی تر حەمدو سەنای خوای گەورە





دەکەیت و سەڵەوات لە دیداری پێغەمبەر (د.خ) دەدەیت. ئەگەر بەم شێوەیە نزا بکەی و بەر کاتەکانی گیرابوونی نزا ئەوە ئەو نزایە رەت ناکرێتەوە (**فأن هذا الدعاء لايعاد ولايرد أبدا ولاسيما إن صادق الادعيه التى اخبر عنها النبي صلى الله عليه وسلم**).

## کاتەکانی پاڕانەوەو نزاکردن

١- الثلث الأخير من الليل: واتە شەو بکەی بە سێ بەش بەشی کۆتایی، لەم کاتەدا خوای گەورە بەگەورەیی و پیرۆزی خۆی دادەبەزێتە ئاسمانی زەوی دەفەرمووێت" ئەی بەندەکانی من کێ داوای لێخۆشبوون دەکات لێی خۆش بم، کێ شتێکم لێ داوا دەکات بیدەمێ، کێ داوای شیفا دەکات شیفای بۆ بنێرم، داوای چی بکەی خوای گەورە داواکەت قبوڵ دەکات (إنشاء الله) لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە خوای گەورە هەلمان بۆ دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی لێی بپاڕێینەوەو داوای لێخۆشبوون و هیدایەتی لێ بکەین بۆ ئەوەی هیدایەتمان بدات بۆ ڕێگای راست، هەموو بەندەکانی خوا هەر هەڵەو گوناه دەکەن خوای گەورە دەرگای لێخۆشبوونی کراوەیە.

خوای گەورە زۆر زۆری پێ خۆشە کە بەندەیەك ئەگەر لە ناکاوی زوڵمی لە خۆی کرد لە دوای ماوەیەك پەشیمان بووەوە زانی کە خوایەك هەیە لە بەندەکانی خۆش دەبێت و دەرگای تۆبەکردن و لێخۆشبوونی کراوەیەو هانای هێنا بۆ خوای گەورەو تۆبەیەکی بەڕاستی کرد خوای گەورە بەتوانایە لێی خۆش بێت و گوناهەکانی بکات بە چاکە.

٢- لەکاتی بانگدان کاتێ وەڵامی بانگ دەدەیتەوە نزاشی لەگەڵدا بکە.

٣- لە نێوان بانگ و قامەتکردن هەتا ئیمام دەست بەنوێژ دەکات.

٤- لەناو هەموو نوێژێکی فەرز نزا و پاڕانەوە بکە بەمەرجێك ئەو نوێژە بەڕاستی بۆ خوای گەورە بکەیت ریایی تێدا نەبێت.

٥- لە شەوی (ليلة القدر) هەتا بەیانی کە خۆر هەڵدێ چونکە ئەو شەوە زۆر پیرۆزە خێری (١٠٠٠) مانگ عبادەتی هەیە.

٦- وە لەمانگی رەمەزان بەتایبەتی لە کاتی (فتارکردنەوە)، رۆژوو شکاندن لەو کاتەدا بەندەکانی خوا بپاڕێنەوە ئەوە خوای گەورە لێیان قبوڵ دەکات.

٧- رۆژی عەرەفە واتە ئۆمینەی حاجییان کە حاجییانی ماڵی خوا ڕوودەکەنە کێوی عەرەفە لەوێ دەمێننەوە (الحج عرفه) لەو کاتە کێ بپاڕێتەوە خوای گەورە لێی قبوڵ دەکات.

خوای گەورە شانازی دەکات دەفەرمووێت بەفریشتەکان سەیری بەندەکانی من بکەن هەر یەکەیان لە شوێنێکەوە بەهیلاکی و ماندوویی هاتوونەو عیبادەتی من دەکەن داوای لێخۆشبوون لە من دەکەن وە داوای رەزامەندی من دەکەن، خوای گەورە دەفەرمووێت بەفریشتەکان ئێوە بەشاهید دەگرم ئەوە من لێیان خۆش بووم و حەجم لێیان قبوڵ کرد، هەر کەسێ لەو رۆژەدا بەرۆژوو بێ بۆ خوا، خوای گەورە لە گوناهی ساڵی رابردوو وە ساڵی ئایندەی خۆش دەبێ (إنشاء الله).

٨- شەوی نوێژی جمعە.

٩- کاتێکی دیاریکراو هەیە لە رۆژی هەینی کە نزاو پاڕانەوەی تێدا قبول دەبێ بەپێی رای هەندێ لە زانایانی ئیسلام ئەو کاتە دەکەوێتە دوای نوێژی عەسر، وەهەندێ دیاریان کردووە دەڵێن دوایین کات لەدوای نوێژی عەسر، هەندێ دەڵێن نازانین بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا بەردەوام ئەو رۆژە خەریکی عبادەت و



پاڕانەوە بن چونکە ڕۆژێکی موبارەکەو جەژنی فەقیرانە.

١٠- لەو کاتەی ئیمام سەردەکەوێ بۆ سەر مینبەر لە ڕۆژی هەینی لەکاتی نوێژی هەینی هەتا نوێژ تەواو دەبێ.

١١- لە کاتی سوجدە بردن (کرنۆش بردن) بۆ خوای گەورە، چونکە لەو کاتەدا بەندە زۆر نزیکە لە خوای گەورە.

١٢- لە کاتی خەتمکردنی قورئانی پیرۆز.

١٣- لە کاتی کۆڕو کۆبوونەوەی مەجلیسی یادو زیکردا.

لەم کاتانەدا بەندەکانی خوای گەورە بەئیخلاسی و دڵسۆزی دەست بەرز بکەنەوە بۆ خوای گەورە وەبزانن گیرابوونی نزاو پاڕانەوەو لێخۆشبوون و شیفا هەر لای خوای گەورەیە.

## شەرتەکانی گیرابوونی نزا

## (قبول الدعاء)

١- قبوڵ بوونی دوعا بەستراوە بەخواناسییەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾.

٢- (الاخلاص) واتە پاڕانەوەکەت دڵسۆزانە بۆ خوای گەورە بێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾.

٣- دەبێ جل و بەرگت و خواردنت حەڵاڵ بێت و لە سەرچاوەیەکی حەڵاڵەوە ئەو نیعمەتانەت دەست کەوێ، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا﴾. وە پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرمووێت **(أطب مطعمك تكن مستجاب الدعوة)**.

٤- پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرمووێت **(يستجاب لأحدكم مالم يعجل)** دوعاو پاڕانەوە قبوڵ دەبێ ئەگەر ئەو بەندە پەلە نەکات چونکە جاری وا هەیە بەندە دەڵێ: **(دعوت فلم يستجب لي)** زۆر پاڕامەوە بەڵام دوعاکەم قبوڵ نەبوو.

٥- هەموو کات دوعاو پاڕانەوەکەت بکەوێتە کاتەکانی دیاریکراو (کاتەکانی قبوڵ بوونی دوعا).

٦- دوعاو پاڕانەوەکەت بەشێوەیەك بێت کە کزۆڵی و بەندایەتی بۆ خوای گەورە بنوێنێ وە تۆبەیەکی ڕاست بکەی وە پەیمانێك لەنێوان خۆت و خوای پەروەردگار تازە بکەیتەوە لەسەرەتادا دوو رکعات نوێژی سونەت بۆ خوای گەورە بکەیت، پاڕانەوەکەش بۆ خۆت دوای ئەوە بۆ کەس و کارت (دایك و باوك و براو خوشك) دوای ئەوە بۆ ئومەتی پێغەمبەر (د.خ) بکەی.

## هۆکارەکانی قبوڵ نەبوونی دوعاو پاڕانەوە

١-یەکێ لە مەرجەکانی قبوڵ بوونی دوعا (خواناسین) بوو، واتە نزیك بوونەوە لە خوای گەورە، بەڵام ئەگەر بێ ئاگا بووی لە خوای گەورە ئەوە پلەی نزیك بوونت لە خوای گەورە کەم دەکاتەوەو تۆ دوور دەخات لە ڕەزامەندی خوا ئەو نزایەش قبوڵ نابێ یا دوا دەکەوێت.

٢- دەبێ باوەڕت هەبێ کە خوای گەورە تاك و تەنیایە کە شەریکی نییە دەبێ پاڕانەوەکەت بۆ ئەو بێ‌و دەبێ باوەڕت بەپاڕانەوە هەبێ، ئەگەر لووت بەرزی بکەی‌و باوەڕت بەدوعا نەبێ ئەوە لێت وەرناگیرێت.

٣- رزق و ڕۆزی حەرام دەبێتە هۆی قبوڵ نەبوونی دوعا.

٤- دەبێ باوەڕت هەبێ کە خوای گەورە شافییەو چارەسەرە، هەر ئەویشە دوعاکەت قبوڵ دەکات.

٥- دەبێ نزایەك بکەیت کە خوای گەورە پێی خۆش بێت ئەگەرنا ئەوە ئەو دوعایەی دوژمنایەتی تێدایە قبوڵ نابێت.

٦- دەبێت نزاکردن دڵسۆزی واتە (ئیخلاص)ی لەگەڵ بێت.

٧- گوناهکردن لەسەریەك و زۆری یاخیبوون (معصیەت) لە خوای گەورە وە ماڵی حەرام





دەبێتە هۆی قبوڵ نەبوونی پاڕانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ﴾ الزمر/٢٢، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: (ادعوا الله وأنتم موقنون بالاجابة واعلموا ان الله لايقبل دعاء من قلب غافل ولاه) لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرمان فەرموویەتی (د.خ): (ایها الناس إن الله طیب لایقبل إلا طیبا).

٨- پچڕانی هاتووچوو (قطع صلة الرحم) ئەبێتە هۆی قبوڵ نەبوونی نزا (في صحيح مسلم عنه صلى الله عليه وسلم: (لايزال يستجاب للعبد مالم يدع بأثم وقطيعة رحم مالم يستعجل).

٩- هۆیەك لە هۆكارەكانی قبوڵ نەبوونی دوعا پەلەكردنە. پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی (في البخاري من حديث ابي هريرة ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (يستجاب لأحدكم مالم يعجل، يقول دعوت فلم يستجب لي) وە لە فەرموودەیەكی تر دەفەرموێت: (في مسند احمد من حديث انس: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (لايزال العبد بخير مالم يستعجل، قال يارسول الله، كيف يستعجل؟ قال: يقول: قد دعوت ربی فلم يستجب لي).

## پاڕانەوە شیفای لەدوایە

لە کاتی نەخۆش بوون و ناخۆشی، بەندەکانی خوا دەست بەرز دەکەنەوەو دەپاڕێنەوە لە بارەگای خوای گەورە داوای شیفا دەکەن بۆ خۆی یان بۆ کەس و کار وەیان بۆ ئومەتی پێغەمبەر (د.خ).

ڕوایەت کراوە لە بوخاری لە (صحیح)دا کە ابو هریرە خوای لێ ڕازی بێت بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی: (ما أنزل الله داء إلا أنزل له شفاء).

واتە خوای گەورە هیچ دەردێك دانابەزێنێت بۆ سەر ڕووی زەوی بەرانبەری (دەرمان و شیفاو چارەسەری) دەنێرێت.

پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: (لكل داء دواء فإذا أصيب دواء الداء برئ بإذن الله).

پاڕانەوەو نزاکردن بەدڵێکی ساف هەرچی نەخۆشی هەیە لای دەبات بەئیزنی خودا.

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: (روى ابو داود من حديث ابی الدرداء قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: من اشتكى منكم شيئا، أو اشتكى له أخ من الم فليقل: (ربنا الله الذي في السماء، قدس اسمك وأمرك في السماء والارض، كما رحمتك في السماء فاجعل رحمتك في الأرض، واغفرلنا ذنوبنا وخطايانا انت رب

## قورئان گەورەترین پلەیە بۆ شیفاو پڕە لە جۆرەها دوعای جۆراوجۆر وە پاککەرەوەی دڵ و دەروونە وە ڕووناککەرەوەی دڵە لە پیسی و بەدڕەفتاری وەهێمنی دەدات بەمرۆڤ

الطيبين، أنزل رحمة من عندك وشفاء من شفائك على هذا الوجع) فيبرأ بأذن الله. پێغەمبەرمان دەفەرموێت ئەگەر بەم نزایە داوا بکەین خوای گەورە شیفا دەنێرێ، إنشاء الله.

لە فەرموودەیەکی تردا (وفي صحيح مسلم عن ابی سعيد الخدری: أن جبريل عليه السلام أتى الى النبي صلى الله عليه وسلم فقال: يا محمد، اشتكيت؟ قال نعم قال جبريل عليه السلام- بسم الله أرقيك من كل داء يؤذيك، ومن شر كل نفس او عين حاسد الله يشفيك، باسم الله ارقيك.

هەر کەسێ ئازاری هەبوو لەشوێنێکی لەشی با بەم دوعایە داوا لە خوای گەورە بکات بەنیازی لێخۆشبوون و پاڕانەوە بۆ ئەوەی خوای گەورە شیفای بۆ بنێرێ وەدوای ئەوە دەست لەسەر ئەو شوێنە دابنێ کە ئازاری هەیە سێ جار بڵێ (بسم الله) ئینجا (٧) جار بڵێ (أعوذ بعزة الله وبقدرته من شر ما أجد





وأحــاذر) خـوای گـەورە إنشـاءالله شیفا دەنێرێ.

حەزرەتی عوسمـان چووە لای پێغەمبـــەر (د.خ) بەپێغەمبـــەری فـەرموو خـوای لێـی رازی بێـت: (ئـازارم هەیـە خەریکـە لـەناوم ئەبـات). پێغەمبـــەر (د.خ) پێـی **فـەرموو بەدەسـتی راسـتت (٧) جـار دەسـتی پێـدا بهێنـە بـەو شوێنەی کە ئازاری هەیە، ئینجا بڵێ (أعوذ بعزة الله وقدرته من شر مـا أجـد وأحـــاذر)**. حـەزرەتی عوسمـان فـەرمووی منیش وتم: (فأذهب الله ماكان بي) واتە ئەو ئازارەی کە هەمبوو نەما بەئیزنی خوای گەورە.

پێغەمبـــــــــەرمان (د.خ) فەرموویەتی شیفا لەم سێ شتە هەیە:

١- آية من القرآن.

٢- شربة عسل.

٣- كية نار.

لێرەدا دیـاری کـردووە شـیفا بەخوێندنی ئایـەتی قورئـان دێـت بەئیزنی خودا.

وەخواردنی هەنگوین، چونکە شیفای تێدایە، دیاری کردووە بۆ هـەموو عـیلاج و چارەسـەرییەك هـەوڵ بـدەن، ئەگـەر چارەسـەری نـەما دوایـین شـت (داغ) کـردن بـەئاگر، چـونکە پێغەمبـەر (د.خ) داخ کردنـی پـێ ناخۆشـە داوای کـردووە ئـەم کـارە نـەکرێت هـەتا بتوانرێت.

پێغەمبـەر(د.خ) فەرموویـەتی (عليكم بالشفاءين)، أي:

١- العسل- هەنگوین.

٢- القرآن- قورئان خوێندن.

یـەکێك هاتـە لای پێغەمبـــەر (د.خ) وتی ئەی پێغەمبەری خودا مـــن ســـینگم ئـــازاری هەیـــە، پێغەمبـــــەر (د.خ) فـــەرمووی: قورئـان بخوێنـە چـونکە خـوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ﴾ یونس(٥٧).

کابرایەکی ئەعرابی هاتە لای پێغەمبـــەر (د.خ) وتـــی: ئـــەی پێغەمبـەری خـوا، مـن برایـەکم هەیـە ئـازاری هەیـە، فـەرمووی، ئازارەکـەی چـییە، پێغەمبـــەر فـەرمووی بیهێنـە بـۆم. هێنایـان خســـتیانە بـــەردەم پێغەمبـــەر (د.خ). ئـەویش دەسـتی کـرد بەخوێنـدنی (الفاتحـة) و چـوار ئایەتی سەرەتای سورەی (بقرة) وە ﴿وَإِلَـهُكُمْ إِلَـهٌ وَاحِدٌ﴾ لەگـەڵ ئایـەتی کورسـی وە سـێ ئایـەتی کۆتایی سورەی بقرة وە ئایـەتێك لە سورەتی (الجن) ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا﴾ جن/٣. وە (١٠) ئایـەت لەسەرەتای سورەی (الصافات) و ئاخر سورەتی المؤمنون ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ طـه ١١٤، وە سـێ ئایـەت لـە کۆتـایی سـورەتی (الحشـر) و سـورەتی (الاخـلاص) وە هەردوو (المعوذتين). پیاوەکە لەبەردەم پێغەمبەر (د.خ) هەڵسا بـێ ئـەوەی ئـازاری هـەبێ (اخرج البيهقي وغيره من الحديث جابر بـن عبـدالله، أن (فاتحـة الكتـاب) شـفاء مـن كـل داء إلا السـام، والسام هو الموت.

لێـــرەدا گرنگـــی ســـورەتی (الفاتحـــة) بەدەردەکـــەوێت بـــۆ هـــەموو نەخۆشـییەك وەشـیفایە تەنها مردن نەبێت.

خـوای گـەورە فەرموویـەتی ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء﴾ فصلت/٤٤ هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ الاسراء/٨٢.

ڕوون دەبێتـەوە کـە قورئـانی پـیرۆز هـەمووی شـیفایە یـان هەنـدێ لـە ئایەتـەکانی شـیفایە، داوامـان لێ دەکـات بیخـوێنین یـان گـوێی لێ بگـرین بـەڵکو خـوای گـەورە رەحممـان پـێ دەکـات، خـوای گەورە فەرموویـەتی ﴿وَإِذَا قُرِىءَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الاعراف/ ٢٠٤.

لێرەدا خوێندن- گوێ گرتن- بـێ دەنـگ بـوون- بیرکردنـەوە لـە ماناکـەی- دوعـاکردن، ئەمانـە دەبنـە هـۆی ئـەوەی کـە خـوای گەورە بەزەیی و شیفا بنێرێت بۆ نەخۆشەکە یان بۆ ئەو کەسە.

چـونکە قورئـان گـەورەترین پلەیە بۆ شیفاو پرە لە جۆرەها دوعـــــای جۆراوجـــــۆر وە پاککـەرەوەی دڵ و دەروونـە وە رووناککـەرەوەی دڵـە لـە پیسـی و بـــەدڕەفتاری وەهێمنـــی دەدات بەمرۆڤ.




# ڕۆڵی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی لە کەمکردنەوەی ڕووداوی مین و تەقەمەنی لە کوردستان

ئەحمەد حەسەن زێڕۆ گەردی*

یەکێك لەو چەکانەی کە لەدوای جەنگیش کێشەیەکی درێژخایەن لە دوای خۆی جێ دێڵێ (مین)ە، دەکرێ بڵێین ئەم چەکە وەك سەربازێکی ون و دوژمنێکی سەرسەخت وایەو هەردەم لە کەمیندایە، دیارە کوردستانیش وەك هەندێ لە وڵاتانی تری دنیا بەدەر نەبووە لەم کێشە سەربازی و کۆمەڵایەتییەدا، بۆیە لە دەرەنجامی ئەم دوژمنە شاراوەیە زیاتر لە (دوو ئەوەندەی) کارەساتی قوربانییانی کیمیابارانی هەڵەبجە قوربانی و زەرەرو زیانی بە خەڵکی سیڤیل گەیاندووە، بەتایبەت لە دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ رووداوی مین لە زیادبووندا بووە، لەنیوەی دووەمی ١٩٩٢ رێکخراوی مرۆیی کۆمەڵەی ئامۆژگاری مین (mag) لە کوردستان دەست بەکاربوو. لەدوای ساڵێك تیمەکانی

چەند نموونەیەك لە مینی دژە تانك






هۆشیاریش شانبەشانی تیمەکانی پاکسازی دامەزران، لە بەهاری ساڵی ١٩٩٨ بەشی هۆشیاری ئەم رێکخراوە پێشکەوتنی دیارو بەرچاوی بەخۆوە بینی ئەویش بەهەماهەنگی و هاوکاری کردن لەگەڵ وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی و مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی

ئایینی ئیسلامی کوردستان، کە توانرا خۆشبەختانە بەرنامەی هۆشیاری مین بۆ کەمکردنەوەی رووداوی دڵتەزێن لە کوردستان چەند کارێکی پیرۆزو بە نرخ بە ئەنجام بگەیەنێ وەك:

* چاپکردنی نامیلکەیەکی ئایینی بۆ هۆشیاری مین.

* کردنەوەی خولی هۆشیاری مین بۆ زانایان و مامۆستایانی




سەر بە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی.

* لەرێگەی قوتابخانەکانی سەر بەم وەزارەتەو مزگەوتەکاندا توانرا هۆشیاری مین پێشکەش بە شارو دێهاتەکانی کوردستان بکرێ.

ئەم هەنگاوانە رەنگدانەوەی باش و ئیجابی هەبوو لە کەمکردنەوەی رووداوی چاوەڕوانکراوی میندا، بەگوێرەی ئەو سەرژمێریانەی کە کراون لە دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٩٨ بەرنامەیەکی چڕوپڕ لە هۆشیاری مین لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی و یەکێتی زانایان هاوکاری دەکران، بە دیارکەوتووە کە رێژەی بەرکەوتووانی لوغم و تەقەمەنی ساڵ بە ساڵ رووی لە کەمی کردووە، ئەمەش رۆڵی وەزارەتی ئەوقاف و یەکێتی زانایان و مامۆستایانی ئایینی بە گشتی دەردەخات بە تایبەتی لە وتاری رۆژانی هەینی مزگەوتەکاندا.

من پێم وایە تاکە وتاری زانایەکی ئایینی بەهێز ترو کاریگەرترە لە سەردانی چەندین رۆژی تیمێکی تەواوی هۆشیاری مین بۆ هۆشیارکردنەوەی دەقەرێك لە مەترسییەکانی لوغم و تەقەمەنی، چونکە ئامۆژگاری و رێنمایی توێژی زانایان کاریگەری زیاترە لەسەر دەروونی زۆربەی تاکی ئەم کۆمەڵگایە، ئەم قەناعەتەم لەوە بۆ دروست بوو لەکاتێ گوێبیستی (٢) دوو وتاری هەینی بووم لە شارۆچکەی دیانا، کە یەکێکیان لە مزگەوتی دیانا لەلایەن بەڕێز (مەلا عەبدوڵڵا مەلا سەعید گرتکی) ئەوەی تر لە مزگەوتی سەیدان لەلایەن بەڕێز (مەلا رەسول گەزنەیی) پێشکەش کرا، بەهۆی چەند رووداوێکی دڵتەزێن لە ناوچەکەدا روویاندابوو، لەئەنجامی بازرگانی کردن بە چەك و تەقەمەنی و کۆکردنەوەی شتی مەترسیدار لەناو ماڵدا، بۆیە ئەم دوو وتارە کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبوو، کە زۆر کەسی ناچار کرد بۆ وازهێنان لەم کارو کردەوە قێزەون و مەترسیدارەدا، بڕواتان بێ لە دوای دەرچوونم لە مزگەوت و بیستنی گفتوگۆو مقۆ مقۆی خەڵك لەسەر وتارەکان زیاتر بۆم دەرکەوت کە مامۆستایانی ئایینی کلیلی دەرگای کۆمەڵگای کوردەواریمانن، چونکە بەهۆی ئەم کلیلەوە زۆر لە هەڵسوکەوتە ترسناکەکان لە رێگای وانەی بەپێزو وتارە بەنرخەکان و پەند وەرگرتن لە رووداوو کارەساتەکان چاکسازی کران و دەکرێن، بۆیە هەر گەلێك گەر بیەوێ بە بەختەوەری و ئاسوودەیی بژی، من پێم وایە دەبێت پەیڕەوو پرۆگرامی ئایینی ئونجا و بگرێتەبەرو، بە رووکاری چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکان و بنەبڕ کردنیان بڕوات بەمەرجێك هەموو لایەك لە یەك سەنگەرو مەیداندا بە گیانی هەرەوەزی و هەوڵی کۆششی یەکگرتوو کاربکەن. زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان، دەستتان خۆش مامۆستایانی ئایینی بەڕێز هەر شادو سەربەرز بن.

**تاکە وتاری زانایەکی ئایینی بەهێز ترو کاریگەرترە لە سەردانی چەندین رۆژی تیمێکی تەواوی هۆشیاری مین بۆ هۆشیارکردنەوەی دەقەرێك لە مەترسییەکانی لوغم و تەقەمەنی**

* کارمەند لە رێکخراوی M.A.G







# کۆریەکان ڕێز لەپێکەوە ژیانی ئایینی دەگرن

**سەلاح شێخ فەتاح نەقشبەندی**

شاندێکی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە پێکهاتبوون لە بەڕێزان مەلا عومەر سوێری پێش نوێژو وتارخوێن لە مزگەوتی سەواف، مەلا عبدالله سعید ویسی پێش نوێژو وتاخوێن لە مزگەوتی گەورەی دیاناو مەلا عابد عوسمان عبدالقادر پێش نوێژو وتارخوێن لە مزگەوتی نۆ شەهید و مەلا عمر حسن مرۆ پێش نوێژو وتارخوێن لە مزگەوتی رشاد مفتی و کاك اسماعیل خالد وەرگێڕی کۆریەکان و صلاح شێخ فتاح نەقشبەندی بەڕێوەبەری نووسینگەی وەزیری ئەوقاف بەداوەتنامەیەکی رەسمی سەردانی ولاتی کۆریا کرا لەرێکەوتی ٢٠٠٦/٤/١٠ لە فرۆکەخانەی هەولێری نێودەولەتی بۆ فرۆکەخانەی دوبەی لەوێش بۆ فرۆکەخانەی ئین چون لەسیئۆلی پایتەختی کۆریای باشوور کە لەلایەن نوێنەری وەزارەتی بەرگری و نوێنەری هێزی زەیتون و نوێنەری گەشت و گوزاری لە وەزارەتی کۆریا پێشوازی کران، ئەم سەفەرە زیاتر بۆ شارەزا بوون لە ولاتی کۆریا. سەردانی ئەو شوێنە ئیسلامییانە بوو کە لە ولاتی کۆریا (٩) مزگەوت هەیە، مزگەوتێکی گەورە لەناو جەرگەی سیئۆلە بەردەوام ئاپۆڕایەکی زۆری لێیە لە موسلمانان و وتاری هەینی تێدا دەخوێندرێ وەنزیکەی (٦٠) مزگەوتی بچووکی لێیە واتە (مسجد) وەنزیکەی (٥٠) هەزار موسلمانی کۆری لێیە وەنزیکەی (١٠٠) هەزار موسلمانی تری غەیری کۆری لەم ولاتە هەیە.

لەم سەفەرەدا سەردانی هەندێ شوێنی مێژوویی کرا وەك (گوندی فۆلکلۆری کۆن) کە دروست کراوە لەشێوازی کۆنی کۆری بەردەوام کۆریەکان سەردانی ئەم شوێنەیان دەکەن بۆ ئەوەی شێوازو فۆلکلۆری





ژیانی پێشووی خۆیان لەبیر نەکەن.

دواتر سەردانی بورجی (نامسان) کرا کە لەسەر شاخێکە لەناوەڕاستی شاری سیئۆل، لەم شوێنە بەرزەدا ڕۆژانە خەڵکی بۆ گەشتوگوزار سەردانی دەکەن و خەڵکی کۆری بەتایبەتی پیرەکانیان ڕۆژانە بەپێ سەردانی بەرپرسی بەشی ئایین لە وەزارەتی بەرگری کۆریا کۆلۆنێل (جیم کیم وات) دەکەن، باسی ئەزموونی گەلی کوردو پەیوەندی دۆستانەی گەلی کوردو کۆری کراو باس لە ئەزموونی ئەمڕۆی کوردستان و ئازادی ئایینی لەکوردستان و دژایەتی کردنی تیرۆر لە کوردستان کراو دیاری وەزارەتی ئەوەقاف و کاروباری ئایینی پێشکەش بەبەشی ئایینی کرا، بۆ نانی نیوەڕۆ داوەتی بەشی ئایینی لەوەزارەتی بەرگری بوون و لەهەمان ڕۆژ سەردانی مۆزەخانەی نێودەوڵەتی سیئۆل کرا.

لەڕۆژی ٢٠٠٦/٤/١٤ ڕۆژی هەینی سەردانی یەکێتی موسڵمانانی کۆریا کرا لەلایەن پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالرازق سونك و دەستەی بەڕێوەبردنی ئەم ڕێکخراوە پێشوازی کران، باسی ئەزموونی ئەمڕۆی گەلی کوردو پەیوەندی دۆستانەی نێوان گەلی کوردو کۆریاو ڕۆڵی زانایانی کوردستان لەخزمەت کردنی ئیسلام و سەرجەم ئازارو ئەشکەنجەی گەلی کورد کە بەدەستی ڕژێمی بەعسی عێراقی بینویەتی و باس لەدژایەتی تیرۆرو بەرقەرار بوونی ئەمن و ئاسایش لە هەرێمی کوردستان کرا.

هەروەها باس لەوە کرا کە کوردستان مەڵبەندی تەساموحی ئایینییەو حکومەتی کوردستان ئازادی ئایینی بۆ هەموو ئایینەکان دابین کردووەو حکومەتی هەرێمی کوردستان خزمەتێکی بەرچاوی پێشکەش بەشوێنە ئایینییەکان و پیاوانی ئایینی کردووە، پاشان دیاری وەزارەتی ئەوقاف پێشکەش بەسەرۆك و ئەندامانی یەکێتی موسڵمانانی کۆریا کرا، هەروەها سەرۆکی یەکێتی موسڵمانانی کۆریا ڕایگەیاند کە خۆشحاڵە وەفدی پیاوانی ئایینی ئیسلام لەکوردستان سەردانی کردووەو ئەم زانیارییانەی لەسەر گەلی کورد وەرگرتووە. وە ڕاشیگەیاند کە گەلی کورد گەلێکی ستەم لێکراوەو وەکو هەموو گەلانی تری جیهان مافی خۆیەتی بەهەموو مافەکانی خۆی بگات.

بۆ ڕۆژی دواتر سەردانی شاری (گیۆنگ جو) کرا، چەندین شوێنەواری کۆن بینراو دواتر سەردانی کۆمپانیای پاسکۆ کرا بۆ دروستکردنی ئاسن و پۆڵا، بۆ ڕۆژی دواتر سەردانی شاری (بوسان) کرا لەلایەن پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی شاری بوسان پێشوازی کران و کۆبوونەوەیەك لەگەڵ پێش نوێژی مزگەوتی ناوبراو دکتۆر (یاسرلی جون ئوك) و ڕۆژنامەیەکی ئەم شارەو چەندین موسڵمانی ئەم شارە ئەنجامدراو بیروڕاکان لەسەر ئیسلام و پێناساندنی گەلی کورد ئەنجامدرا، دواتر بۆ نانی نیوەڕۆ میوانی دەستەی موسڵمانانی شاری بوسان بوون، وە لەم شارە سەردانی شوێنە مێژوویی و گەشت و گوزارییەکان کرا.

بۆ ڕۆژی دواتر ٢٠٠٦/٤/١٦ سەردانی کۆمپانیای هیوندای کرا بۆ دروست کردنی هەموو جۆرو مۆدیلی ئۆتۆمبێلی هیوندای، پاشان بۆ ڕۆژی ٤/١٧ بەرەو شاری سیئۆل بەڕێکەوتن و لەوێوە بۆ فرۆکەخانەی ئین جون لەوێوە بەرەو فرۆکەخانەی دوبەی نێودەوڵەتی و لەوێشەوە بەرەو کوردستانی ئازیز شاری قەڵاو منارە، شاری هەولێر.




# هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان لەڕێگای بینینی وێنەوە '

**شه پۆل لازم شێخۆ**

پێکهێنانی پرۆسەی هاوسەرگیری لەڕێگای بینینی وێنەوە ئەگەرچی نەبۆتە دیاردە بەڵام بوونی هەیە لەنێو کۆمەڵگا دواکەوتووەکانداو کۆمەڵگای کوردەواری پشکی تێدا هەیە، بەتایبەتی لەنێو ئەو کەسانەی کە ئاستی پلەی خوێندەواریان زۆر نزمەو کاریگەری خێڵەکیو عەشایەری زاڵە بەسەر ژیانیان لەنێو کۆمەڵگادا دوورن لە گۆڕانکاریو کرانەوە، شێوەی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە بریتییە لە ئاڵودەبوونی یەکێك لە بووکەکان یاخود زاوایەکان بەو وێنەی کە پێی نیشان دەدرێو بڕیاری پێکهێنانی خێزان دەدا لەسەر بنەمای بینینی ئەو وێنەیە، نیشاندانی ئەم وێنەیەش لەڕێگای کەسێکەوە دەبێت کە ئەویش یان دایکە یان کەسێکی نزیکە یاخود برادەرێکیانە، زۆر جاران ئەو کەسانە تێوە دەگلێن کە داماون یاخود ئەو کەسانەی کە ناتوانن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەریان گفتوگۆ بکەن.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەورووژێنێت ئایە دەکرێت بەسانایی ئەو چەشنە بڕیارە چارەنووسسازە بدرێت لەسەر بنەمای دیتنی وێنە؟ بێگومان نەخێر، چونکە پرۆسەی هاوسەرگیری بریتییە لە ناسینی تەواوی یەکتریو وێکەوە گونجان ئەوەش نایەتە کایەوە بەبێ بینینی یەکتر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو دیتنی خودی کەسەکە کە ناتوانێ لەو کاتەدا هەر ناتەواوییەکی جەستەیی هەبێت بیشارێتەوە بەڵام وێنە بەپێچەوانەوە دەتوانرێ فروفێڵی لەگەڵدا بکرێ، وێنەش ڕۆژێك لەرۆژان نەبووەتە پێوەر بۆ جوانیو دانانی بناغەو پەیوەندی خێزانی سەرکەوتوو، ئەوانەی بەجوانی وێنە هەڵدەخەڵەتێن کەسانی کەمتەرخەمن و بایەخ بەرەوشت و بەها و لایەنە کۆمەڵایەتیەکان نادەن لەپێناو شێوەو ڕواڵەتی دەرەکییانە. کە دواتر دووچاری چەندین کێشە دێن کە چارەسەرکردنیان دەبێتە شتێکی ئەستەم و دەرئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە وەك "لێکجیابوونەوە، دوژمنایەتی" لەوانەشە لە سەدا یەکی ١٪ ئەم جۆرە ژنخواستنانە سەربگرێ، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە خۆمان بکەینە نێو ئەو چوارچێوەیە ئەم جۆرە ژنهێنانە لەرووی ئاینیشەوە ناپەسەندەو ئیسلام بەشتێکی باشی نازانێت چونکە پێغەمبەر "د.خ" جارێك بەیەکێك لە یاوەرانی خۆی فەرموو کە نیازی خواستنی ژنێکی هەبوو پێغەمبەر فەرمووی بڕۆ سەیری بکە بۆ ئەوەی خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە، هەر بۆیە پێویستە ئەم جۆرە ژنخواستنە ڕەت بکرێتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە نیمچە دیاردە لەنێو کۆمەڵگاکەماندا، تەواوی ئاسانکاری بکرێت بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ هاوسەری ژیانیان هەڵبژێرن کۆسپ و لەمپەریان بۆ دروست نەکرێت لەلایەن خێزانەکانیانەوە بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکەمان دوور بێت لەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەو سروشتی ڕەسەنایەتی وەربگرێت.




# چارەسەرکردنی دەردو نەخۆشییەکان بە قورئان

وەرگێران و ئامادەکردنی: د.ئازاد مستەفا مەحمود

زاراوەی ڕوقیە بەکوردی نوشتە دەگەیەنێت، خوێندنی ئایەت و نزای تایبەتییە بەمەبەستی شیفا. ئاشکرایە کە سورەتی فاتیحە ڕوقیەیە. فەرموودەی ئەبی سەعیدی خودری بەناوبانگە. تاقیش کراوەتەوە کە بەکەڵکە.

ئەنجامدانی ڕوقیەکە لەلایەن کەسێکی خواپەرستەوە مسۆگەرتری دەکات. ئەگەر فاتیحە خوێندنەکە "معوذات"ی لەگەڵ بێت باشتریشە. مەعلوومە کە حەزرەت (د.خ) هەموو شەوێك بەسەر خۆیدا خوێندوویەتی، هەروا لەنەخۆشی مەرگ باشتروایە ڕوقیەکە بەسێ ڕۆژ ئەنجام بدرێ بەیانیان و ئێواران وەکو لە فەرموودەیەکا هاتووە. فووکردن لەگەڵیاو تەنانەت تفکردنیش جائیزە. ئایینی خوا بەئارەزوو و ئەقڵ نییە. پێشینان و پاشینان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو تفە بەقورئانەوە پیرۆز بووە. لە پزیشکی نوێشدا دەم لەناو دەم بۆ قوتارکردن هەیە لەحاڵەتی فریاگوزاری سەرەتاییدا.

ئەوەش دەبێت بزانین کە کارەکە پسپۆری (تخصص)ی ناوێت بگرە خۆت بۆ خۆتی بکە یان بەیەکێك لە موسڵمانان بیکە. ژن بۆ مێرد. مێرد بۆ ژن. هەمووی جائیزە. لێ کۆکی هەیە لەسەر خواناسیی زیاتر کە کەڵکی زێترە. واتە چەند کەسەکە خواناستر بێت سوود پتر دەگەیەنێت، چونکە خوای تەعالا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ سوورەتی مائیدە (ئایەتی ٢٧).

حەزرەت (د.خ) وەنەبێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی تەنیا ڕێی نوشتەی پیشان دابێ بەڵکە هەنگوینی پەسەند کردووە بۆ شکست، شەپکە (جبیرة)ی بەچاك زانیوە وەکو خوا فێری ئادەمی کردووە، یان ڕەشکەو ڕۆنی زەیتونی پەسند کردووە.

حەزرەت (د.خ) دوویشك پێیوەیداوە ئاو و خوێی پێوە ناوەو سورەی (کافرون) و (معوذتین)ی بەسەردا خوێندووە. ئەمانە ئەوە دەگەیەنن کە لەپاڵ نوشتەی شەرعی پێغەمبەر (د.خ) گرنگی بەداو و دەرمانیش داوە.

ئیمامی (ابن القیم) دەفەرموێت: قورئان شیفای تەواوەتییە لەهەموو دەردە دەروونیی و جەستەییەکان و نەخۆشیی و ناخۆشیی دونیاو ئاخیرەت. هەر کەسیش سەرکەوتوو نابێت بۆ چارەسەرکردن بەقورئان، ئەگەر نەخۆش بزانێت چۆن چۆنی بەکاری بهێنێت بۆ چارەسەرکردن، بەبیرو بڕوا وەرگرتنی تەواو وەری گرت و مەرجەکانی تێدا هاتنە دی، هەرگیز نەخۆشییەکە بەسەریدا زاڵ نابێ، چۆن نەخۆشییەکان بەرگەی فەرموودەکانی خوداوەندی زەمین و ئاسمان دەگرێ ئەگەر بەسەر چیادا بێنە




دابەزین وردو خاشی دەکات و بەسەر ئەرزدا بێتەخوار پارچە پارچەی دەکات، بۆیەکا هیچ دەردێك نییە لە دەردەکان چ هی دڵ و دەروون چ هی جەستە کە لەقورئاندا هۆی دەلالەتکردن لەسەر چارەسەرییەکەی و هۆکارەکەی و خۆ لێ پاراستنەکەی نەبێت بۆ هەر کەسێك کەوا خوای مەزن و بالاّ دەست تێگەیشتنی لە کتێبی خۆی کردبێ بە ڕۆزیی.

هەر چەند قورئان چارەسەرە وەلێ ڕەوابوونی قورئان بۆ چارەسەری مانای ئەوە نییە کەدوا چارەسەری بێ بۆ گشت شکایەتێك چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: "ئەی بەندەکانی خوا چارەسەری بکەن چونکە خوای میهرەبان چ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانێکی بۆ دانەنابێت تەنیا دەردێك نەبێت کە پیرییە". بۆیە پشت لەدەرمان کردن و تەنیا ڕووکردنە قورئان پێچەوانەی فەرمانی حەزرەتە (د.خ). چونکە قورئان شیفایەکە لە شیفایەکان و تاکە شیفا نییە، یان چارەسەرێکی ئەوتۆ نییە کە پێویست بەچارەسەری نەکات.

قورئان ڕەنگە- کە ئەویش تاقیکردنەوەیەکە لەلایەن خواوە- شیفای تەواوەتی نەبێت لە هەندێك نەخۆشی بەڵکو لەئێش و ئازاری نەخۆش کەم دەکاتەوە و باری تەندروستی چاکتر دەکات، قورئان لەوانەیە شیفای عیللەتی نەخۆشێك بێت کە ڕەنگە شیفای کەسێکی دیکەی پێ نەیەت کە هەمان عیللەتی هەیە. (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت:

"دوعاش لە بەسوودترین دەرمانەکانەو دوژمنی بەلاّیەو لەگەڵیا لەجەنگایەو نایەڵێ دابەزێ و هەڵی دەگرێ وەیا هێورتری دەکاتەوە ئەگەر هاتە خوار وەهەروەها چەکی ئیماندارە.

دوعاش (کە نوشتەش بەشێکیەتی) لەگەڵ بەلاّدا سێ مەقامی هەیە:

یەکێکیان ئەوەیە: کە لە بەلاّ بەهێزتر بێت و دەفعی بکات.

دووەم: لە بەلاّ بێ هێزتر بێت و بەلاّ بەسەریا زاڵ بێت و بەندە دووچاری بەلاّکە بێت، لێ هەر چەندە لاواز بێت بەلاّکە هەر سووکتر دەکات.

سێیەم: هەر دووك لە جەنگا دەبن و هەر یەك ئەوی دیکە لەناو دەبات و نایهێڵێت.

لە عائیشەوە (ڕ.خ) لە پێغەمبەرەوە (د.خ): **"لايغني حذر من قدر، والدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل وان البلاء لينزل فيتلقاه الدعاء فيعتجلان إلى يوم القيامة"**.

هەروەها (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەر (د.خ) بۆ نەخۆشی سێ جۆر چارەسەری داناوە:

یەکەم: دەرمانە سروشتییەکان.

دووەم: دەرمانە خوداوەندییەکان.

سێیەم: بەتێکەڵی هەردووکیان.

بۆیەکا موسڵمان دەبێت پەنا بەرێتە بەر هەر هەموویان.

> **هیچ دەردێك نییە لە دەردەکان چ هی دڵ و دەروون چ هی جەستە کە لەقورئاندا هۆی دەلالەتکردن لەسەر چارەسەرییەکەی و هۆکارەکەی و خۆ لێ پاراستنەکەی نەبێت**

**سەرچاوە:**

١-العلاج النفسي والعلاج بالقرآن، د.طارق بن علي الحبيب، ط٨. دار البيت العتيق الاسلامية عمان- الاردن. ١٤٢٤هـ-٢٠٠٤م.




# زانیارییە پەیوەستەکان بەخۆراکەوە..

سروە مستەفا - پسپۆڕی زیندەوەرزانی

پێشەکی خوداوەندی میهرەبان لە قورئاندا بەم شێوە دەفەرموێت ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ (ئایەتی/ ٣١ سورەتی الاعراف) ڕاڤەی ئایەتەکە ئاوایە کەوا بخۆن و بخۆنەوە (لە نازو نیعمەتەکان) بەڵام زیادەڕەوی مەکەن چونکە بەڕاستی خودا لەسنوور دەرچووان و زیدەڕەوانی خۆش ناوێت.

ئەگەر ئاو و هەوا بەیەکەوە سەرچاوەی هەرە سەرەکیی ژیان بێت بەهەمان شێوە خۆراك بەشێکی گرنگ و تەواوکەری ژیانی ئادەمیزادە، کە هەموو مرۆڤێك بەدەر لەجیاوازی ڕەگەزو چینایەتی ڕۆژانە وەك خشتەی هەمیشەیی بەلای کەم سێ ژەم خۆراك بەکاردەهێنێت و دەخوات بەهۆی وابەستەبوونی سروشتی ژیانیەوە.

لەتەك دۆزینەوە زانستی و پزیشکییەکانی هەمبەر خۆراکدا چواردە سەدە لەمەوبەر دەیان ئایەتی قورئانی پیرۆز ئامارەی بە بابەتی خۆراك کردووەو بەیەکێك لەبەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگاری جیهانیان دەهێنێتە هەژماردن و منەتباری دەکاتە سەر بەری ئادەمیزاد وەکو چاکەو نیعمەت لەگەڵ کردنێك خۆراکی پێ بەخشیوەو کردوویە بەپێداویستی ژیان، بەرونی و ئاشکرایی لەسورەتی (الرحمن) ئایەتی (١١ بۆ ١٢)دا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ * وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ﴾ واتە: لەو زەوییەدا هەیە میوەی خۆش و خورماو دانەوێڵە کە ساق و پەل و پۆدارە، وەگیاو سەوزەی بۆن خۆش هەندێکی خۆراکی ئادەمییە هەندێکی دیکەی بۆ ماڵات و گیانلەبەرانە، وەهەشیانە بۆ بۆن و هەناسە خۆشییە، ئەمانە هەموو پەروەردگار فەراهەمی هێناون لەو زەوییەدا کە دروستی کردووە بۆ خەڵکی لەیەکەم جارەوە میوەی باس کرد کە تەنها بۆ خۆشی و تام و چێژ وەرگرتن ئەنجا خورما کە میوەو خۆراکە، دانەوێڵەش خۆراکەو ژیان لەسەر ئەودا وەستاوە لەهەموو کونجێکی ئەو زەوییە ئەگەر مرۆڤی لێ بژیت.

خواردنی باش یەکسانە بەتەندروستی و دیمەنی باش، خۆراك ئەو وزە پڕ لە نهێنییەیە کە تا لێی بکۆڵینەوە زانیاری زیاترمان دەسگیر دەبێت، کام لەئێمە بیر لەوە دەکاتەوە چ جۆرە خواردنێك بۆی گونجاوە تا بەکاری بهێنێت تەنانەت ئێستا لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا پسپۆڕانی خۆراك بۆ دەستنیشان کردنی جۆری خواردنی هەر کەسێك پشت بەگروپی خوێنی ئەو کەسە دەبەستن! لێرەدا هەندێك زانیاری لەبارەی خواردنەوە بەشێوەیەکی گشتی دەردەبڕین:

١- پرۆتین سەرچاوەکەی گیانەوەرییە وەکو (شیرو هێلکەو گۆشت) کاریگەری زیاتری هەیە لەپرۆتینی رووەکی (پاقلەو نیسك و نۆك) بۆیەشە دانیشتوانی (ئەسکیمۆ)ی جەمسەری باکوور چالاکترو بەهێزترن لە چینییەکان کە پشت بەپرۆتینی رووەکی دەبەستن.





پـــرۆتينيش دوا بـــــەدواى نەشـــتەرگەرى پێويســـتە زۆر بايـەخى پێبـدرێت چونكە بۆ سارێژبوونى برين بەسوودە، ئـەم رێژانـەش بـڕى پرۆتينـى پێويستن بـەگوێرەى تەمـەن و حاڵەتى ئەو كەسە بۆ نموونە:

أ- ئەو پياوەى كار دەكات و لـە جموجۆڵدايـە پێويستى بە (٨٠-٩٠گم) پرۆتين هەيە.

ب- هـەروەها ئـافرەتيش ئەگـەر كـارى كـردو چالاكى و وزەى بەخشـى پێويستى بـە (٦٠گم) پرۆتين هەيە.

ج- هـــەرزەكار بەگشـــتى رۆژانە پێويستى بە (١٠٠گم) پرۆتين هەيە.

د- ئافرەت لـە مانگـەكانى كۆتـايى سكپڕيدا پێويسـتى بـــە (١٠٠گـــم) پرۆتينـــــە، لـــەماوەى شـــير پێدانـــدا پێويســـــتى بـــــە (١٠٠-١٢٠گم)ە.

**چواردە سەدە لەمەوبەر دەيان ئايەتى قورئانى پيرۆز ئاماژەى بە بابەتى خۆراك كردووەو بەيەكێك لەبەڵگەكانى دەسەڵاتى پەروەردگارى جيهانيان دەهێنێتە هەژماردن**

**ئەگەر ئاو و هەوا بەيەكەوە سەرچاوەى هەرە سەرەكيى ژيان بێت بەهەمان شێوە خۆراك بەشێكى گرنگ و تەواوكەرى ژيانى ئادەميزادە، كە هەموو مرۆڤێك بەدەر لەجياوازى ڕەگەزو چينايەتى ڕۆژانە وەك خشتەى هەميشەيى بەلاى كەم سێ ژەم خۆراك بەكاردەهێنێت و دەخوات بەهۆى وابەستەبوونى سروشتى ژيانيەوە**

٢- ڤيتـامين (C) هـانى وەرگـرتن و مـژينى پـرۆتين دەدات بۆيـە ئـەويش لـەدواى نەشـتەرگەرى پێويسـتە بـڕى زيـاد بكرێـت، باشـترين سەرچـــاوەش بـــۆ (Vitaminc.c.)، (گێـــزەرو مەعـــدەنوس و ليمـــۆ)يـــە، سـپێناغيش بـەو ڤيتامينـە دەوڵەمەنـــدە بەمـــەرجێك بـەتازەيى بخورێـت چـونكە دواى (٢٤) كاتژمێر لە ٥٠٪ى ڤيتامينەكـەى ون دەكـات، كەچـى لەهەنگوينـدا هـەر دەمێنێت و كەم ناكات.

٣- ســـەوزەو ميـــوە بـەخۆراكى پـارێزەر نـاوزەد دەكرێـت چـونكە لـەكاتى زۆر خواردن يارمەتيمان دەدات.

٤- رەگـــەزى (mg) كـــە لەســـەوزەواتدا زۆر گرنگـــە، پزيشـكان واى بـۆ دەچـن ئـەو كەســـانەى زۆر هەڵدەچـــن لەخوێنيانـــدا ڕێـــژەى (مەگنيسيۆم)ى كەمە.

٥- تـــوخمى مەنگـــەنيز پەيوەنـــدى بەســـــۆزى دايكايـــەتى هەيـــە ئـــەو مشـكانەى كـە ڕێـژەى (mn) لەخوێنيانـدا كەمـە شـير بەبێچووەكانيان نادەن.

٦- توخمى برۆم لەهەندێ حاڵـەتى خەمۆكيـدا كـەم دەبێتـەوە مرۆڤەكـە تاچـاك نەبێتەوە ناگەڕێتەوە جێگەى خۆى.

٧- ئاسن (Fe) بۆ خوێن دروست كردن (هيمۆگلۆبين) باشـە و زۆر جاران خواردنى گـڵ لـە منداڵـدا (Pica) ئاماژەيـە بـۆ كـەم خـوێنى، چـونكە بڕێكـى زۆر ئاسـنى تێدايە.

**سەرچاوەكان:**


١- تەفسيرى قورئانى پيرۆز جزمى ذاريات لا١٥٠.

٢- تەفسيرى ئاسان.

٣- العائلة- د.غسان جعفر.

٤- الوعي الغذائي الصحي (م. زراعي: محمد سيد أحمد حنفي).





# یاسا چییە؟

## مێژووی سەرهەڵدانی یاسا لە وڵاتە عەرەبیو ئیسلامییەکاندا

بەشی کۆتایی

جاسم عاڵلایی*

لە ساڵی ١٩٣٤ حکومەت یاسای (الموجبات) گرێبەندەکانی بەکارکرد کە قازییەکی فەرەنسی ناوی (روبرس) بوو داینابوو، دوایی مادەکانی پیشانی (جوسران)دا کە سەرۆکی ئامۆژگای ماف بوو لەزانکۆی (لیۆن)، وێڕای ئەوەی ڕاوێژکاری حکومەتی فەرەنسیش بوو، دەستکارییەکی زۆری ئەم یاسایە کرا. مەبەست لەیاسای (الاحکام العدلیە)یە هەتا هەڵوەشاوە. هەروا دەستکارییەکی زۆری ئەحکامەکانی ئەم گۆڤارە کرا چونکە پێچەوانە بوو یا لەگەڵ دەقەکانی یاسای (الموجبات) ڕێك نەدەکەوت، بەم جۆرە لە (ئەحکامی مجلەی عدلیە) هیچ نەمایەوە هەڵنەوەشێتەوە لەیاسا پێشووەکانی مەگەر چەند دەقێکی کەم نەبێ. وە لەساڵی ١٩٣٣ یاسای بنەڕەتی دادگاکانی شارستانی لوبنانی داندرا شوێنی بەکاربوو کە ئەم یاسایە لەدانانی (بارو) بوو کە یەکێکە لە مامۆستایانی ئامۆژگای (لیۆن).

لەساڵی (١٩٣٤) کار بەیاسای بازرگانی نوێ کرا کە لەدانانی دوو مامۆستای فەرەنسی بوو...

لە ساڵی (١٩٤٤) کار بەیاسای نوێی سزا کرا.

لە ساڵی (١٩٤٦) کار بەسزاکانی سەربازیو یاسای بازرگانی دەریایی کرا.

لە ساڵی ١٩٤٨ کار بەیاسای بنەڕەتی دادگاکانی سزا کرا(١).

بەتێکڕایی یاسا نوێکانی لوبنان هەر هەمووی لە یاساکان و هەوڵ و کۆششەکانی ئەورووپا وەرگیرابوو کە پڕ بوو لە بیروڕاو بیردۆزی مافە ڕەواج پێدراوەکانی فەرەنساو ئەڵمانیاو سویسراو هی تر لە کەم مەسەلەیەکیشدا هەندێ ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام یا نەریتی عارەبییان وەرگرتبوو(٢).

### ٥-٩ یاسا دانراوەکان لەسوریا

قازییەکان لەسوریا کاریان بەو یاسایانە دەکرد کە لە تورکیا دەرچووبوون پێش شەڕی جیهانی یەکەم. چونکە سوریا بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، هەر یاسایەك لە تورکیا دەرچووبایە لە سوریاش جێ بەجێ دەکرا.

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم سوریا ملکەچ بوو بۆ ژێر ڕکێفی فەرەنسا، جا فەرەنسییەکان لەماوەی (انتداب) زۆر هەوڵیان دا ئەو یاسایانە بگۆڕن کە لە شەریعەتی ئیسلام





وەرگیرابوو، بەلأم گەلی سوریا دژی ئەم هەولأنە ڕاوەستان(٣) ئەم یاسا ئیسلامییانە بەردەوام بوون لەم ولأتەدا هەتا سوریا سەربەخۆیی وەرگرت. هێزی فەرەنسا لەساڵی ١٩٤٦ لە سوریا کشایەوە، لەدوای کشانەوەی هێزی فەرەنسا حکومەتی نیشتمانی توانی ئەم یاسایە بگۆڕێ کە لە شەریعەتی ئیسلام وەرگیرابوون بەیاسا دانراوەکان.

وەیەکەم یاسا دەرچوویێ پاش سەربەخۆیی سوریا یاسای (البینات) بوو لەمادەکانی شارستانی و بازرگانی.

لەساڵی (١٩٤٧) ئەم یاسایە لەدادگایە شەرعییەکان جێبەجێ کرا بەمەرسومێك کە لە ساڵی (١٩٤٩) دەرچوو.

لەساڵی ١٩٤٩ (حسنی) هەڵستا بەکودەتایەکی سەربازی لە سوریا یەکەم شت کە پێی هەڵستا ئەو یاسایانەی گۆڕی کە لەشەریعەت وەرگیرابوو، فەرمانی دا بەپێکهێنانی لیژنەیەك بەسەرۆکایەتی وەزیری دادی ئەو کات کە ناوی (اسعد الكوراني) بوو.

سێ سایای بەکار دەرچوو لەساڵی یەکەمی تەمەنی کودەتاکە کە ئەمانە بوون:

١- یاسای شارستانی. ٢- یاسای بازرگانی. ٣- یاسای سزا.. کە لەیاسای عێراقی و میسری و لوبنانی وەرگیرابوون.

وە لەساڵی ١٩٥٠ سێ یاسای تر دەرچوون ئەویش ١-یاسای بازرگانی دەریایی. ٢-یاسای بنەڕەتی داگای سزایی. ٣- یاسای سزای سەربازی بوون هەر سێکیان لەیاساکانی لوبنانی گواسترابوونەوە لەبارەی تەرتیب و زۆری مادەکانەوە. وە لەساڵی ١٩٥٣ یاسای بنەڕەتی دادگای مافداریێتی دەرچوو وێڕای باری کەسایەتی(٤).

## ٥-١٠ یاسا دانراوەکان لە ئوردن

ئوردنیش ملکەچی حوکمی عوسمانی بوو لەدوای جەنگی جیهانی کەوتە ژێر ڕکێفی بەریتانیا بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان کە لەساڵی (١٩٢٢) دەرچوو بەردەوام کاری بەو یاسایانە دەکرد کە لەتورکیا بەرکار بوون.

وە لەساڵی ١٩٥١ لە ئوردن یاسای سزاو یاسای بنەڕەتی دادگاکانی سزایی دەرچوون کە زۆربەی لە یاساکانی لوبنانی و سوری وەرگیرابوون.

(مجلەی ئەحکام العدلیە)ی تورکی لەئوردن جێبەجێ دەکرا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ. لەساڵی ١٩٦٦ پرۆژەیەکی شارستانی دەرچوو کە لەیاسای شارستانی میسری وەرگیرابوو، دوا بەدوای ئەم پرۆژەیە جەماوەر نارەزاییان دەربڕی و بووە هۆی درەنگ دەرچوونی بۆ ماوەیەك.

لەساڵی ١٩٧٦ یاسای شارستانی دەرچوو لەگەڵ پارێزگاری کردنی زۆربەی ئەحکامەکانی (مجلەی العدلیە) و وێڕای گوڵبژێرکردنێکی زۆر لەبنەمای یاسا دانراوەکان(٥).

## ٥-١١ یاسا دانراوەکان لە هندو پاکستان

شەریعەتی ئیسلام یاسای گشتی دەوڵەتی هند بوو. کاتێ بەریتانیا هندی داگیر کرد دەسەڵاتی شەریعەتی کەم کردەوە. لەسەرەتادا شەریعەتی ئیسلامی تایبەت کرد بەموسڵمانانەکان لەساڵی ١٧٧٢.. دوایی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا یاسایەکی تریان داهێنا دەقەکەی ئەوە بوو شەریعەتی ئیسلام کار پێ دەکەین لە هەموو کێشەکان وەکو میرات و ژن هێنان و هەندێ




کێشەی تر لە داب و نەریت و مەسەلەی چینایەتی کە پەیوەندی هەیە بە موسڵمانەکانەوە.

لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەم دەسەڵاتدارانی بەریتانیا دەستیان کرد بەیاساو تەشریع دانان، لەساڵی (١٨٤٣) یاسایەکی تریان دەرکرد کە بەند بوو بەیاسا هەڵوەشاوەکان.

وە لەساڵی (١٨٦٢) یاسای سزاو یاسای بنەڕەتی دادگای سزایی بەرکاربوون.

وە لەساڵی (١٨٧٢) یاسای (البینات)ی هندی دەرچوو، وە لەساڵی (١٩١٣) یاسای ئەوقافی دەرکرد.

ئامانجەکانی دەستوریان تیادا ڕوون کردەوە... وە لەنێوان ئەم بنەما داهاتووانە بەیانی بنەمای دیموکراتی و ئازادی و یەکسانی و گیانی لێبوردن و دادگەری کۆمەڵایەتی کرابوون کە کۆك بن لەگەڵ تەعالیمی ئیسلامی.

وەپاکستان بەدەستوری ساڵی (١٩٥٦) بووە کۆماری، بەڵام دەستورەکە هەڵپەسێردرا لەبەر کودەتایەکی سەربازی لە ساڵی (١٩٥٨)(٦).

## ٦-١ کۆتایی

لەبەر ئەوەی سەرچاوەکانی یاسا جۆر بەجۆرن، سەرچاوەکانی سیستەمی یاساکانیش لێك جیاوازن لە وڵاتە ئیسلامییەکان بۆیە دەتوانین بڵێین سیستەمی یاسا لە دەوڵەتە ئیسلامییەکان بۆتە سێ بەش:

١- بەشی یەکەم: کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری یاسای فەرەنسی و لاتینی، بریتین لە وڵاتەکانی میسرو لیبیاو مەراکیش و جەزائیرو لوبنان.

٢- بەشی دووەم: کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری یاسای ئینگلیزی بریتین لە وڵاتەکانی سودان و عێراق و ئوردن.

٣- بەشی سێهەم: ئەو وڵاتەی نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری هیچ یاسایەك بەڵکو پارێزگاری لە کەلەپووری ئیسلامی کردووە کە بریتییە لە مەملەکەتی عەرەبی سعودی(٧).

**قازییەکان لەسوریا کاریان بەو یاسایانە دەکرد کە لە تورکیا دەرچووبوون پێش شەڕی جیهانی یەکەم. چونکە سوریا بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، هەر یاسایەك لە تورکیا دەرچووبایە لە سوریاش جێ بەجێ دەکرا**

وە لەساڵی (١٩٤٧) پاکستان وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرا بۆ ڕۆژی دوایی پەیوەندی کرد بە (رابطەی الکومنولث)ی بەریتانیا... وە لەساڵی (١٩٤٩) کۆمەڵەی دامەزراندن بەیانێکیان ڕاگەیاند

## دەرئەنجام و ئاکامەکەی

هەندێ لە حاکمەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە ئەحکامی شەریعەت دەردەچوون بە بەهانەی ئەوەی دەیانەوێ دەوڵەت لەڕێی سیاسەت بەڕێوە بەن. ناویان لەو دەرچوونە نا سیاسەت (ڕامیاری) هەروەکو (ابن تیمیە) دەڵێ(٨) (فەرمانڕەواکان بەگشتی زۆر جۆرە سیاسەتی خراپیان داهێنا لەژێر پەردەی سیاسەت، زۆر ماڵی ناڕەوایان دەست کەوت، زۆر سزای ناڕەوایان بۆ تاوان دانا... وە لە شەریعەت





نــەزانینیان وای لــیّ کــردن کــە فــــەرمانڕەواکان لـــــە هەنــــدیّ ئەحکامی شەرعی لادەن.

هـەروا (ابـن تیمیـە) دەڵـیّ(٩): (سـەرەتای کـارکردن بەسیاسـەت یـا (یاسـا) پێچەوانەی شـەریعەت بـــوو، وەشـــەریعەت نـــەزانینیان خاڵی سەرەکی بوو. لەمەدا کاتی خلافـە گەیشـتە دەسـت کـوڕانی عەباسـی پێویسـتیان بەسیاسـەت یـــا (یاســـا) بـــوو بـــۆ خـــەڵکی، دادگاکان لاسایی شەرع زانەکانی عێراقیـــان کـــردەوە بـــۆ دادگـــایی کـــردن، زانســـتی تەواویشـــیان نـــەبوو دەربـــارەی سیاســـەتێکی دادگەرانـــە لەبـــەر ئـــەوە کـــاتیّ پێویستییان بە ستەمکردن بوو، ویلایــەتی جــەنگییان گرتــە بــەر لەجیـــــاتی ویلایـــەتی شـــەرع لەبـــەر ئـــەوە کاروبـــار زۆر گـــران راوەســـــتا لـــــە زۆربـــــەی شـــارە موسڵمان نشینەکان هەتا وای لیّ هـــات دەیـــــانگوت شـــــەرعو سیاسەت...

ئـــەو دوژمنەکـــەی خـــۆی بانگهێشت دەکرد بۆ شەرعو ئەم بـانگی دوژمنەکـەی دەکـرد بـۆ سیاسـەت تـاوای لـیّ هـات دوو حاکمیـان دانـا، یـەکیان حـوکم بەشـەرع بکـاو حاکمەکـەی تریـان حوکم بە سیاسەت بکا.

هـــــەتا وای لـــــیّ هـــــات لەســـــەردەمی مـــــەمالیك ئـــــەمیر (الحاجب)ی مەمالیك حوکمی لە هـەموو مەسـەلەیەکی زۆرو کـەمی خـــــەڵك دەکـــــرد هـــــەتا لـــــە مەســـەلەکانی قـــەرزو بازرگـــانی بەشـێوەیەکی تایبـەتی کـە هـیچ لەگـەڵ شـەرع کـۆك نـەبوو، بـەڵام لەگـەڵ سیاسـەت کـۆك بـوو(١٠). دوا بـەدوای خەلافـەی عەباسـی هەر بەناوی سیاسەت هەندیّ لە حوکمـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی هـــەر لەســـــەرەتای دامەزرانـــدنی دەوڵـەتی عوسمانییـــەوە چـــەند یاســـایەکیان دانـــا پێچـــەوانەی شەریعەتی ئیسلام بوو(١١).

لـــەئاکامی توێژینەوەکـــەمان دەگەینـــە ئـــەم دەرئەنجامـــەی مێـــژووی سیاســـەت یـــا روونـــتر بڵێین (یاسـا) لـە وڵاتـە عـەرەبیو ئیســلامییەکان دەگەڕێتــەوە بــۆ سەردەمی خەلافـەتی عەباسـی... بـەڵام مـن لام وایـە بـۆ کـۆنتر لـەم مێژووە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلافـەتی ئەمەوییـەکان کـە لـەو کـاتی گـۆڕین لەزمانـەکانی تـر بـۆ ســـەر زمـــانی عـــەرەبی دەســـتی پێکـــردو هاتنـــە نـــاو جیهـــانی ئیســـــلامی وەکـــــو فەلســــــەفەو سیاســـــەتو کـــەلامو منطیـــقو ســـــۆفیایەتی کـــــە کتێبـــــەکان بـــــەزمانی یۆنـــــانیو لاتینـــــیو ئــــــــــــەغریقیو فارســـــــــــــی نووسرابوونەوە.

## پەراوێز:

١- فلسفة التشريع ص١٠٢-١٠٩.

٢- المصدر السابق ص١٠٩.

٣- المصدر السابق ص١١١.

٤- الاتجاهات التشريعية ص٨١.

٥- بحوث في الشريعة الاسلامية والقانون- للدكتور محمد عبدالجواد- المجموعة الثانية ص١٠ مطبعة جامعة القاهرة.

٦- القانون الاسلامي وطرق تنفيذه لابي الاعلى المودودي ص١٣٩.

٧- الاتجاهات التشريعية في البلاد العربية للدكتور شفيق شحاته ص٩.

٨و٩- اقتضاء الصراط المستقيم لابن تيمية- مطبعة السنة المحمدية- القاهرة.




١٠- الخطط للمقريزي ٣/٣٥٧.

١١- المصدر السابق.

## سەرچاوەكان:


١- القرآن الكريم.

٢- ابحاث واحاديث في الفقه والقانون، للدكتور عبدالرحمن البزاز طبعة مطبعة العاني بغداد، ١٩٥٨.

٣- الاتجاهات التشريعية في قوانين البلاد العربية للدكتور شفيق شحاته- طبعة المطبعة العالمية القاهرة ١٩٦٠.

٤- اصول تاريخ القانون للدكتور عمر ممدوح مطبعة معهد دون بالاسكندرية ١٩٥٨.

٥- بحوث في الشريعة والقانون للدكتور عبدالجواد محمد- المجموعة الثانية- مطبعة جامعة القاهرة والكتاب الجامعي ١٩٧٧.

٦- تأريخ حركة التجديد في النظم القانونية في مصر للدكتور شفيق شحاته- مطبعة دار احياء للكتب العربية القاهرة.

٧- تأريخ النظم والشرائع للدكتور عبدالسلام الترمانيني طبعة جامعة الكويت.

٨- التعريفات للجرجاني- مطبعة مصطفى البابي الحلبي القاهرة ص١٤٩.

٩- تفسير ابن الكثير- طبعة دار الاندلس- بيروت- ١٩٦٦ المجلد ٢/٥٩٠.

١٠- التقنين المدني المصري- للدكتور جمال الدين العطيفي- نشر دار النشر للجامعات المصرية- القاهرة.

١١- فكرة القانون- لدينيس لويد، طبع المجلس الاعلى للثقافة والفنون والادب/ الكويت.

١٢- فلسفة التشريع، لصبحي محمصاني- طبع دار العلم للملايين الطبعة الثالثة ١٩٦١.

١٣- القاموس المحيط، طبعة المكتبة التجارية الكبرى- القاهرة- الطبعة الخامسة ٤/٢٦١.

١٤- القانون الاسلامي وطرق تنفيذه، لابي الاعلى المودودي، طبعة دار الفكر بيروت/ ١٩٦٧.

١٥- الكليات لابي البقاء ايوب الكفوي- منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي- دمشق ١٩٧٦ القسم الرابع.

١٦- لسان العرب لابن منظور- اعداد وتصنيف يوسف خياط ونديم مرعشلي، دار الادب العربي- بيروت، ٣/١٧٧.

١٧- مبادئ تأريخ القانون للدكتور صوفي ابي طالب- طبع دار النهضة العربية/ ١٩٦٥.

١٨- المدخل لدراسة القانون للدمتور منير الوتري- مطبعة حداد- البصرة.

١٩- المدخل للعلوم القانونية للدكتور توفيق فرج، طبعة دار النهضة، الطبعة الرابعة/ ١٩٦٩.

٢٠- الوسيط في شرح القانون المدني، للدكتور سنهوري، الطبعة الثانية ١٩٦٤ طبعة دار النهضة.

٢١- محاضرات في نظرية القانون للدكتور محمد علي- طبعة مطبعة نهضة مصر القاهرة/ ١٩٥٣.

٢٢-الخطط للمقريزي ٣/٣٥٧-٣٥٩.

٢٣-نظام القضاء لاحمد فتحي بك- الاولى- مطبعة الجريدة ١٩١٠..


* وتارخوێنی مزگەوتی حاجی عەزیز لەهەولێر.




# جۆرەکانی ئەمانەت

**مافپەروەر- ازاد عبدالقادر مستەفا**

پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی (**لاأيمان لمن لاأمانة له**) ماناکەی ئەوەیە هەر کەسێك ئەمانەتی نەبێ ئیمانی نیە.

ئەگەر باسی ئەمانەت بکەین بۆمان دەرئەکەوێ کەزۆر شێوەو جۆری هەیە.

وەفاداری مندالأن بۆ دایك و باوکیان جۆرێکی گرنگە لەئەمانەت لەبەر ئەوەی لەسەرەتای بوونی مندالْ ئەرکی دایك و باوکە کە ئاگاداری بن لەگشت رویکەوە تاگەورە دەبێ و گشت پێداویستیەکانی بۆ جێ بەجێ بکەن و لەژێر چاودێری تەواویان دابێ.

بەرامبەر بەو ئەرکە پێویستە مندالْیش وەفادار بێ و ئەمانەتی سەرشانی جێ بەجێ بکات و لەخزمەت کردنی دایك و باوکی درێغی نەکات



بەتایبەتی کە تەمەنیان گەورە بوو، چونکە پێویستیان بەچاودێری هەیە، دەبێ بزانی کە رەزامەندی دایك و باوك لەرەزامەندی خودایە.

لەلایەکی ترەوە ئەرکێکی گەورە لەسەرشانی بازرگانەکانە کە دەتوانین بەجۆرێکی تری ئەمانەتی دابنێین ئەمەش بریتیە لە خیانەت نەکردن لەگشت جۆرە مامەڵەکردنێك لەگەڵ هاوولأتیان لەکاتی فرۆشتنی خۆراك و گشت پێداویستیەکانی ژیان، چونکە خیانەت کردن جۆرێکە لەجێ بەجێ نەکردنی ئەمانەت. زۆرجار وارێك کەوتووە لەئەنجامی فرۆشتنی خۆراکی تێکچوو زۆر کەس تووشی نەخۆشی و هیلاکەت بووە. جگە لەوەش یاری کردن بەنرخی کەل و پەل خیانەت کردنە لەگەڵ ئەو ئەمانەتەی کەوتۆتە سەر شانیان.

جۆرێکی تر لەئەمانەت بریتیە لەئەرکەکانی فەرمانبەر کەپێویستە بەدڵسۆزی جێ بەجێ بکات. هەر فەرمانگەیەك چەند ئەرکێکی لەسەر شانەو پێویستە ئەنجامی بدات.

چونکە ئەم ئەرکانە پەیوەندی تەواویان بەژیانی رۆژانەی هاوولأتیان هەیە. هەر لەبەر ئەمە فەرمانبەر لەشوێنێك کار بکات پێویستە




کاتــەکانی کــارکردنی بــۆ خزمـەتی هاوولاّتیـان تـەرخان بکات.

لێـرەدا بۆمـان دەردەکـەوێ چـونکە هــەر دەزگایــەکی مـیری ئـیش و کـاری تایبـەتی کردنــی شــێوازی یەکســانی لەنێوان هاوولاّتیان.

**هەر دەزگایەکی میری ئیش و کاری تایبەتی خۆی هەیە و مەبەستی سەرەکیش لە کارەکانیان خزمەت کردنی هاوولاّتیانە و سەرهەلّدانی هەر کەم و کوریەك لە جێ بەجێ نەکردنی ئەرکەکان دەبێتە مایەی نیگەرانی و دلّ تەنگی هاوولاّتیان**

کــە دلّســۆزی فەرمانبــەر لەئــەنجام دانــی کارەکــانی سـوودێکی بـاش بەئەنـدامانی کۆمـەلّگا دەبەخشـیّ و دەبێتـە نیشانەی وەفاداری و دلّسۆزی بۆ نیشتمان و نەتەوەکەی.

جـۆرێکی تــر لەئەمانــەت بریتیە لەهەلّسانی بەرپرسان و کاربەدەســتانی فەرمانگــەکان بــــەجێ بــــەجێ کردنـــی ئەرکــــەکانی سەرشــــانیان بەشێوەیەکی دروست و پەیڕەو خــۆی هەیــە. مەبەســتی ســەرەکیش لــە کارەکانیــان خزمەتکردنی هاوولاّتیانە.

ســەرهەلّدانی هــەر کــەم و کوریەك لەجێ بەجێ نەکردنی ئەرکــەکان دەبێتــە مایــەی نیگــــەرانی و دلّ تــــەنگی هاوولاّتیـان، لێـرەدا دەمـەوێ باسی یەك لەو کارانە بکەم کە نیگەرانی پەیدا دەکات ئەویش نــەبوونی یەکســانییە لــە مامەلّەکردن لەگەلّ هاوولاّتیان.

زۆرجــار دەبیــنین و یــان دەبیستین کە جیاوازی دەکرێ لەنێوان ئەندامانی کۆمەلّگا لە جێ بەجێ کردنی کارەکانیان. هەنــدێ کــەس کەیارمــەتی دەریـان هەیـە ئـیش و کاریـان زۆر بەئاســانی بــۆ دەکــرێ بەپێچـەوانەی ئـەوانی تـر کـە هــیچ یارمــەتی دەرێــك لــە تەکیانــەوە نیــە، بۆیــە کارەکانیـان لەگـەلّ ئـەوەی کـە رەواو یاساییە بەلاّم بۆیان جێ بەجێ ناکرێت.

لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکـەین کـە ئـەم کەسـانەی ئـەم جــۆرە کردارانــە لەگــەلّ هاوولاّتیــان دەکــەن ئەوانــە فــەرموودەی پێغەمبــەر (د.خ) لەسەریان جێ بەجێ دەبێ.

لــەکۆتایی دا پێویســتە لەســەر گشـت لایـەکمان هـەولّ بـدەین کـە ئـەو ئەمانەتـەی لەســەرمان دانـراوە دلّسـۆزانە جێ بەجێ بکەین.

# شمس الاسلام




مجلة ثقافية علمية اسلامية
تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الدينية
لاقليم كوردستان العراق

شعبان / ١٤٢٧ هـ ايلول/ ٢٠٠٦ م گەلاویژ/ ٢٧٠٦ ك





**العنوان**

اربيل
ديوان وزارة الاوقاف والشؤون الدينية
مديرية الاعلام

 ٢٢٣٠٩٤٤ ٢٢٢٢٦٩٣




# في ذكرى الخالدين
# القاضي رشاد المفتي
# (١٩١٥-١٩٩٢م)



بقلم: محمود خليل زەرگەزەوی*

ما من شيء الا ويهلك، وما من حي الا ويموت.. يقول عز من قائل في محكم كتابه ﴿ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام﴾ الرحمن: ٢٧﴾ و﴿كل نفس ذائقة الموت﴾ من الآية ٣٥﴾.

في مثل هذه الايام من العام ١٩٩٢ وتحديدا في ١٢/ ايلول/١٩٩٢ رحل عنا الاستاذ العلامة القاضي رشاد محمد المفتي عن ٧٧ عاما حافلة بخدمة الدين والعلم والتراث والمجتمع الكوردي.. ان واجبي الاجتماعي يلزمني ان اكتب في هذه السطور القليلة مشاعري بمناسبة الذكرى السنوية الرابعة عشرة لرحيل فقيدنا المرحوم رشاد محمد المفتي، كوفاء لفضيلته المغفور له.





**فنقول هو: رشاد بن محمد المفتي بن ملا عثمان بن ملا ابي بكر الشهير ب (كچك ملا الاربيلي) ينتسب الى واحد من اعرق بيوتات العلم في كوردستان، ذو مكانة عالية رفيعة في خدمة الدين والعلم والأدب وتميز بها عبر مئات من السنين!..**

## لماذا اطلق عليه اسم (رشاد)؟

**روي من نفسه انه: عندما ولد كان ابوه (محمد المفتي) يقرأ القرآن الكريم وعندما دخل عليه البشير بانه رزق بولد، كان قد وصل الى الآية الكريمة ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ / غافر: ٣٨﴾. فتيمن بالقرآن الكريم وقال ان اسمه رشاد.. وهكذا استخرج اسمه من القرآن الكريم..**

## رشاد المفتي أم محمد رشاد المفتي؟

**كثيرا ما حصل الالتباس بين بعض الناس في تسمية رشاد المفتي أم محمد رشاد المفتي، والحقيقة ان اسمه رشاد واسم ابيه محمد ولقبه المفتي.. لكن عند تعينه قاضيا لاول مرة كتب اسمه محمد رشاد المفتي، وقد رفع المرحوم عريضة لوزير العدل بهذا الخصوص يذكر فيها بالتفصيل الاسباب التي دفعت الى ذلك ويطلب تغير الاسم من محمد رشاد المفتي الى رشاد محمد المفتي باسلوب ديني ادبي مقنع.. وهذا نص بعض من عريضته لوزير العدل:**

بسم الله الرحمن الرحيم

السيد وزير العدل المحترم..

بواسطة السيد رئيس محكمة استئناف منطقة كركوك المحترم..

لا يخفى عليكم بان العادة والعرف المحلي بين المسلمين في منطقتنا هي اضافة كلمة (عبد) على اسماء الاشخاص الذين يسمون باحدى اسماء الله الحسنى تأدبا مع مقام رب العالمين مثل جبار وغفار فيقال عبدالجبار وعبدالغفار وهكذا.

وكذا ضم كلمة (محمد) الى اسماء اكثر الاشخاص مثل سعيد ورشيد ورشاد وأديب و.. فيقال محمد سعيد ومحمد رشيد وهكذا... تيمنا باسم النبي محمد (ص) وتفاؤلا بسلامة صاحب الاسم المضاف اليه محمد... واني قاضي اربيل رشاد المفتي محمد بن عثمان، نوديت من صغري اسم محمد رشاد كأمثالي من الاسماء، ولما كانت والدي مفتيا في محافظة اربيل في حينه اصبحت كلمة (المفتي) لقبا لأفراد العائلة بأجمعها، وصدر الامر الاداري بتعيني قاضيا باسم محمد رشاد المفتي دون ذكر اسم ابي وجدي في الامر المذكور، وهذا يوهم أحيانا وعند البعض بان اسمي محمد واسم ابي رشاد خلافا للحقيقة والواقع، لذا أرجو الامر بتعديل الامر الاداري الانف الذكر بزيادة أسمي ابي وجدي فيه واعتباري رشاد المفتي بن محمد بن عثمان بدلا من محمد رشاد المفتي دفعا للالتباس في المستقبل عند إكمالي خدمة الوظيفة.

**المستدعي**

**رشاد المفتي محمد عثمان**

**قاضي محكمة شرعية اربيل**

**١٩٧٤/١٢/١٠**

**ولد رشاد المفتي بقلعة اربيل في سنة ١٩١٥م ونشأ في كنف والده الذي كان مفتيا لأربيل لحين وفاته، وتفتحت عيناه منذ الصغر على شعائر**





الـدين، وذهنـه علـى العلـوم الدينيـة، دخـل المدرسـة الابتدائية بأربيل، ولكن والده آثر تفرغه لعلوم الدين فأخرجه مـن المدرسـة ليـدرس العلـوم الاسلامية المختلفة وان ينـزوي مع باقي طلاب العلم في مدرسة جـامعهم لتحصـيل العلـوم.. فـدرس التفسـير والحـديث والفقـه وأصـولهما وعلـوم الشـريعة والمواريـث، وعلـم المنطـق وعلـم الفلـك السـائد انـذاك، والاسـطرلاب والربـع المجيـب والربـع المقنطـر و...

## ان تقليد اقامة الموالد النبوية في اربيل قديم يعود الى ايام الملك مظفرالدين أمير اربيل (٥٨٦-٦٣٠هـ) وهو الذي اوجد هذا التقليد الحسن في اربيل ومنها انتقل الى العالم الاسلامي

كـذلك تعلّـم علـى يديـه اللغـة الفارسـية والتركيـة وآدابهمـا وفي عـام ١٩٣٤م أرسـله والـده الى الأزهـر الشريف بالقاهرة لينهل مـن منابعـه، فـدرس علـوم الـدين، ونـال شـهادته العلميـة بعـد إكمـال سـنوات الدراسـة وهـو اول طالـب كـوردي يخـرج مـن كوردستان العراق ليدرس في الجامع الأزهـر.. وهـذا نص شهادته:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله، والصلوة والسلام على سيدنا محمد وأله وصحبه..

قال تعالى: ﴿فَلَوْلا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ /التوبة: من الآية ١٢٢) وقال صلى الله عليه وسلم (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين).

**الجامع الازهر الشريف**
**شهادة الأهلية للغرباء**

قد نال الشيخ (محمـد رشـاد المفـتي بـن محمـد المفـتي) مـن ناحية اربيل بكوردستان شهادة الأهليـة الـتي قررهـا (مجلـس الأزهـر الأعلى) وذلـك بعـد اداء الامتحـان بنجـاح في (الفقـه، التفسـير، الحـديث، مصـطلح الحـديث، التوحيـد، النحـو، الصرف، المعاني، البيان، البديع، المنطق) وانا نوصيه بتقوى الله تعـالى والاسـتزادة مـن العلـم النـافع حتـى يبلـغ درجـة العلماء... انتهى.

ثم بعد إكمال دراسته في الازهر الشريف عاد الى اربيـل وهـو متـاثر بأسـاتذته في الأزهـر واسـلوب تفكيرهـم وتدريسـهم امثـال (الشـيخ محمـد علـى المراغـي- شـيخ الأزهـر) و (الشـيخ عمـر وجـدي- شيخ رواق الاكراد في الازهر) و (الاستاذ محمد على عوني) فضـلا عـن اعجابـه الشـديد بـ(الشخ محمـد عبدة) ونهجة العصري في تفكيره.

وبعد عودته داوم على الاستزادة من العلم على يد والده، وعلى الملا ابي بكر افندي الشهير بملا افندي، ومن جهة اخرى داوم على تدريس عدد من الطلبة (فەقێ) في مدرسة الجامع الكبير بقلعة اربيل، وبعـد وفـاة والـده في ١٩٤٦/١٠/٢٧م قـام مقامـه في خطابـة المسـجد، وأصـبح خطيبـا فخريـا الى ماقبـل وفاته، وهو اول خطيب كوردي القى الخطبة بلغته الكورديـة الأم.. وفي سـنة ١٩٥٦م عـين قاضـيا في كركـوك ثـم انتقـل الى السـليمانية في سـنة ١٩٥٧م وظل فيها قرابة عام، ثم نقل الى اربيل ومارس فيها

